## ١٤٠٥-١٣٣٦
## دووەمین ئیمپراتۆری مەنگۆلی لەژێر فەرمانڕەوایەتی تەیمووری لەنگ دا لە کوردستان:

لە سەردەمی تەیمورلەنگ دا، وەک لە (ظفرنامە)دا باسی لێکراوە، میرنشینێکی بە هێزی کورد، لە ژێر فەرمانڕەوای (ئیبراهیم خانی بەتلیسی)دا لە ئاردابووە. هەروەها لە ماوەی سالآنی ١٢٩٧-١٣١٠دا چەندین راپەرینی خوێناوی و بە هێزی کوردەکان دژی فەرمانڕەوای مەنگۆلەکان بەرپابووە.



سوارچاکێکی کورد
هنری بیندەر: سەدەی ١٩

## ١٣٦٠

ابن بطوطه ( لە ١٣٧٧ مردووە) باسی ئەوە دەکا کە لەو سەردەمەدا شارەکانی مووسڵ و ماردین و سنجار چەند شارێکی کوردنشین بوونە.

## ١٣٩٠

ابن خلدون (١٣٣٢ـ ١٤٠٦) لە (کتاب العبر، ب ٢، ل ٤١٣ و ٤٦١ دا) باسی ئەوە دەکا کاتێ هێزی مەغۆل کوردەکانیان تالآن کرد و کوشتنیان، هەندێ لە هۆزە کوردەکان ناچاربوون بەرەو سووریا و میسر و جەزائیر کۆچ بکەن.

## ١٤٢١ -١٣٥٦

- مەلا پەرێشان بە دیالێکتی گۆران شیعر دەنووسێ.

## سالانی ١٤٠٠

بووژانەوەیەکی ئەدەبی بە زمانی کوردی، لە سێبەری میرنشینی ئەردەلانەکاندا دەست پێدەکات. لەو شاعیرانەی بە کوردیی گۆران دەنووسن: شاوەیس قولی (١٤٠٧ ـ ١٤٨٢ )، عالی قەلەندەر (١٤٣٤ ـ ١٥١٢ ). هەروەها مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لە بنەماڵەی زانیاران چاپی بەغدا ١٩٨٤ ل ١١٨دا دەڵێ کە مەلا گوشایش لە دەوروبەری ساڵی ١٤٤٦دا ئیسلامەتیی لە ناوچەی هەوراماندا بڵاوکردۆتەوە.

## ١٥٣٥ – ١٤٥٠

ناودارترین میناتۆرسازی ئێرانی، کەمالەددین، ناسراو بە بەهزاد (١٤٥٠ – ١٥٣٥) لە شاری هورات و تەورێزدا ژیاوە. شا ئیسماعیلی سەفەوی بەهزادی نیگارکێش لەگەڵ خۆیدا راپێچ دەکات بەرەو پایتەخت.

## ١٤٣٥: قەرە قۆینلوو

بنەماڵەیەکی تورکمانی شیعەگەر بەناوی قەرە قۆینلوو «مەڕی ڕەش» کە ماوەیەکی زۆر بوو لە مەڵبەندەکانی ئەنادۆلی ئاسیای بچووکدا گەیتشبوونە پلەی دەسەڵات، لە ساڵی ١٤٣٥ باشووری رۆژهەلاتی کوردستان (واتە کوردستانی عیراق و ئێرانی ئەمڕۆ) داگیر دەکەن. هەر لەو سەردەمەدا کە کوردەکانی موکریان زنجیرەیەک راپەرینی شێرانە دژ بەم بنەماڵە تورکمانە شیعەگەرە بەرپا دەکەن لە پێناو پاراستنی دەسەڵاتی نەتەوەیی خۆیان لەناوچەی باشووری گۆمی (ورمێ)دا .

## ١٤٧٠: ئاق قۆینلوو

بنەماڵەیەکی دیکەی تورکمان بەناوی ئاق قۆینلوو «مەری سپی»- کە بە پێچەوانەی «قەرەقۆینلوو» سوونni مەزهەب و سوننەگەربوون لە ساڵی ١٤٧٠دا لە سەرەتادا ناوچەی هەکارییان داگیر کرد، پاشان تەواوی مەڵبەند و ناوچەکانی بۆتانیان خستە ژێر رکێفی خۆیان و شاری دیاربەکریشیان کردە پایتەختی خۆیان. سەرتاپای ئوستانی جەزیرە و مەڵبەندی بۆتان کەوتنە ژێر دەسەڵاتیانەوە.



میناتۆرێکی کوردی، سەدەی ١٨م

**١٤٠٠**

– نوێژە مەسیحییەکەی تۆماس مێتسۆب (١٤٠٠).

کوردناسی فەرەنسی، تۆما بوا، دەڵێ: لە ساڵی ١٩٣٧دا، پرۆفیسۆر عەبدوللازادە لە ئارشیفخانەیەکی کۆنی ئەرمەنییەکاندا لە شاری ئێتشمیازین Etch-miadzin بە خەتی مێژوونووسی ئەرمەنی، تۆماس مێتسۆپ T. METSOP (کە لە ١٤٤٦دا مردووە) دەسنووسێکی دۆزیبیەوە کە لە ساڵانی ١٤٠٠دا نووسراوە و چەندین ئەلفابێی جۆراوجۆری تێدایە.. هەروەها چەند نوێژێکی مەسیحییەکانی تێدایە بە حەوت زمانی جیاواز، لەوانە بە زمانی کوردیش.

Thomas BOIS: Bulletin Raisonne d Etudes Kurdes, Imprimerie Catholique, Beyrouth: 1964. P. 551.

– لە ژمارەیەک دەسنووسی ئەرمەنیدا چەند دێڕێکی کوردی بە ئەلفوبێی ئەرمەنی نووسراوە. یەکێک لەو دەسنووسانە دەربارەی ڕێزمانی ئەرمەنییە و لە سەدەی پازدەدا نووسراوەتەوە، بەڵام چەند دوعایەکی بە عەرەبی و فارسی و کوردی تێدایە.

– مەولوودنامەکەی مەلای باتێ (١٤١٧– ١٤٩٥)، کە تۆژەران ڕایان وایە کۆنترین مەولوودنامەیە نووسرابێت. ئەم مەولوودنامەیە، کە بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و مێژووی نووسینی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵانی (١٤٠٠)، بەپێچەوانەی مەولوودنامەکانی دیکەی سەدەی نۆزدەم، هەمووی بە شیعر نووسراوە.

**١٤٧٣**: بڵاوکردنەوەی گەشتنامەکەی زێڕنگەری باڤاری (ژۆهان سچیل بەرگەر) کە تێیدا باسی کوردستان دەکات و وەسفی گەلی کورد دەکات.

**١٤٩٢– ١٥٥٣**: ئێل بەگی جاف بە دیالێکتی گۆران شیعر دەنووسێ.



## ١٥٠٢

### فەرمانڕەوایەتیی صەفەوییەکان

شا ئیسماعیل (یەکەمی) ئێران دەسەڵات دەگرێتە دەست و دەوڵەتی سەفەوی، بەناوی بنەماڵەکەیەوە لە ئێران دادەمەزرێنێ، کوردستانی ئەمڕۆی ئێران و عیراق، هەروەها بەشێکی کوردستانی تورکیاش (تاکو شاری مەڕەش) داگیر دەکات.

## ١٥١٢

عوسمانیەکان، کە تازە خەریکە دەسەڵاتیان لە ئەستەمبۆڵەوە بەرەو کوردستان نزیک دەبێتەوە، دەیانەوێ کوردستانی ئەمڕۆی تورکیا بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

## ١٥٠٠

لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا، لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠دا، لە دەوروپشتی کێوی شنروێ لە نزیک شارۆچکەی هەڵەبجە، پەخشانەکانی (سروودی یارسان) سەرهەڵدەدەن کە تێکەڵەیەکی پەخشان و شیعرن بە دیالێکتێکی تێکەڵی هەورامی - لەکی - کرماشانی نوسراون و پێیان دەگوتری «دەفتەر» و نادارترینیان بریتیە لە «سەرەنجام»؛ قسەکانیش پێیان دەگوترێ «کەلام». زۆربەی بۆچوون لەسەر ئەوە رێکن کە سوڵتان ئیسحاق نووسیونی و ئیمامی عەلی بە رەمزی خوا دەزانێ؛ بۆیەش بە پەیڕەوکارانی گوتراوە «عەلی ئیلاهی»، بە مەزهەبەکەشیان دەگوتری «ئەهلی حەق».

لە بەشی ٥، سروودی یارساکان دا هاتووە:

خوا ئارەزووی کرد کە تیشکی زاتی خۆی لە بەشەردا بنوێنێ.



جەنگی ئەربێللا، میناتۆری بەهزاد

## ١٥١٤

جەنگی چاڵدێران، لەنێوان شا ئیسماعیلی سەفەوی ئێران و سوڵتان سەلیمی عوسمانیدا، لەو جەنگەدا (ئەمیرخانی بەتلیسی) پشتی سوڵتان سەلیمی عوسمانی دەگرێ دژ بە شا ئیسماعیلی سەفەوی: ئەمە دەبێتە هۆی تێک شکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی، لە پاداشتی ئەمەشدا سوڵتان سەلیمی عوسمانی دان بە سەربەخۆیی میرنشینی (ئەمیرخانی بەتلیس) دەنێ و پەیمانی دەداتێ کە دەست نەخاتە ناو کاروباری ناوخۆی ئەم میرنشیە کوردیەی ئەمیرخانەوە.

به مەعمووری که مەشهووری جیهان بوو خاکی کوردستان
هەموو وێرانەیە ئێستا لە زوڵم و وەحشەتی تورکان
لەبەر لاشەی بەنی ئادەم چ مومکین هاتوچۆکردن
لە نەعرەی برسێتی قابیل نیه ئینسان نەبێ گریان
چیه ئەم زوڵمە ئەمڕۆ تورک ئەیکا لەم عیبادەی تۆ!
فەقیر و دەوڵەمەند، شاه و گەدا، شەو تا سەحەر ناڵان
به کافرمان ئەزانن هەمشەهری، ئەم قەومە بێ عەقڵە
هەتا کەی حیزی سادەی وەرنە غیرەت قەومی گەل کوردان
...
لەبەر داری مەمەد عالەم هەموو هاتوونە ترس و لەرز
چ فەرقمان ما لەگەڵ قەحبە به دینتان عەشرەتی گۆران
که ئینسان ئەفزەڵی مەخلووقە هیچ فەرقی نیه ئەمڕۆ
لەگەڵ حەیوانی ناتیق هەر دوو بووینە مەئکەلی گورگان
تەماشای ئەهلی لادێ کەن هەموویان بوونە سلقی ڕووت
لەدەس یەغماگەری، ژاندرمە و مەئمووری بێ ئیمان
به زیندوو ئیکتیفا نەکرا تەعەڕوز کرایە شەخس و پیر
نە شێخی نۆدێ مەحفووز ما نە قەبری حاکمی بابان
...
هەموو جەستەم بریندارى قوڵنگی جەیشی تورکانە
سروشکی زار زاریمە بە یبللا شێوی سەرقەبران
لەناو کوردایەتی غیرەت نەماوە هەموومان قەحبەین
لە خیتتەی جزیرە تاکو ئەچێتە شاخی هەورامان
کە شێخ عەبدولسەلامیان کوشت ئەگەر بێدەنگ نەبووینایە
چ تورکێ حەددی بوو دەس دا لە نەجلی سەییدی عەدنان
ئەگەر ئەم حیزییە تا سەر دەوام کا وای لە حاڵی کورد
ئەناڵێنین لە ئێشی زیللە و شەق، خائیب و خەسران
...
دە هەڵسن تاکو ئێمەش دەوڵەتێکی کوردی تەشکیل کەین
وەکو قەومی یەهوود و سرب و بولگار، ئەرمەن و یۆنان
فەلەستین و یەمەن، قەتعەی حیجاز و گورجی و ئەرمەن
هەموو بوونە قڕاڵ و ئیمپراتۆر، حاکم و سوڵتان

**فایەقی تاپۆ**

دەروازەی دووەم

# کرۆنۆلۆژیای کوردستان
## ١٥١٤-١٨٩٨



وێنەی سەرەوە: ڕاپەڕینی بەختیارییەکان لە کوردستانی ئێران (سەدەی ١٩)
وێنەی خوارەوە: زوڵمی تورک لە کوردستانی تورکیا (لایەنگیرانی شێخ سەعیدی پیران ئەسیر کراون)



## ژیانی کولتووری
## ١٥١٤-١٨٩٨

**١٥٢٠** : لەدایکبوونی سەیدەی هەورامی
**١٥٣٠- ١٦٠٠**: عەلی هەریری

**١٥٣٤ ـ ١٥٣٦**: گەریدەیەکی عوسمانی، ناسح مەترەقچی بە کوردستاندا گەڕاوە و سەفەرنامەیەکی نووسیوە و باسی کوردستانی کردووە: (سولەیماننامە) کە لە ١٥٤٥دا لەگەڵ کۆمەڵێک میناتۆردا بڵاوکراوەتەوە. بەشێک لەم میناتۆرانە کوردین یان لەبارەی کوردستانن.

**١٥٤٣ ـ ١٦٠٦**: ژیانی شەرەفخانی بەتلیسی، کە لە ١٥٩٧ میری میرنشینی بەتلیسە و دەست دەکاتە نووسینی (شەرەفنامە) و کێشانی بیست تابلۆ ناودارەکەی.

**١٥٥٧**: سەیدی عەلی رەئیس Seydi Ali Reis کە بەپێی مێژوونووسی یۆنانی، Stephan YERA-SIMOS دەفتەرداری دیاربەکر بووە. لە ١٥٥٣ـ١٥٥٧ لە گەشتنامەیەکی خۆیدا بە عوسمانی، باسی سەرتاپای کوردستانی کردووە.

**١٥٦٣- ١٦٤١** : فەقێی تەیران
**١٥٦٧- ١٦٤٠**: مەلای جزیری
**١٥٧٧**: خەسرۆ خانی ئەردەڵانی: «تاریخ اردلان» بە فارسی.

**١٥٨٦ ـ ١٥٨٧**: سەلیمی سلێمان، شاعیری کوردستانی تورکیا: داستانەشیعری یووسف و زلێخا.

**١٥٩١**: عەلی تەرەماخی لە ١٥٩١ بەدوواوە هەڵکەوتووە

## ژیانی سیاسی
## ١٥١٤-١٨٩٨

**کوردستان لە ١٥١٤ بەملاوە دابەشکراوەتە سەر دوو ئیمپراتۆریەتی فارس (صەفەوی) و تورک (عوسمانی)**
- بە فەرمانی سوڵتانی سەلیمی یەکەم (١٨) میرنشین لە ناوچە کوردنشینەکاندا پێکهاتن کە هەموویان ملکەچی ئەستەمبوڵ بوون. لە هەمان کاتیشدا زۆربەی میرنشینە فەرمانڕەوا یاخییەکانی وەک (ئازیزان) و (حەسەنکێف) و (شێروان) ڕووخێندران.

**١٥١٥/٨/٩**: مۆرکردنی پەیمانی میرنشینە کوردییەکان و سوڵتان، بە هاوکاریی مەلا ئیدریسی بەتلیسی کە مەلایەکی کوردی داردەست، سیخوڕ و لایەنگیری عوسمانیەکان بوو.

**١٥٤٨- ١٥٤٩**: داگیرکردنی بەشێکی خۆرهەڵاتی کوردستان لەلایەن سوڵتان سلێمانی عوسمانییەوە. ئنجا هێرش کردنە سەر ڕوواندز: بۆ ئەوەی بتوانن داگیری بکەن.

**١٥٥٣**: لەشکری عوسمانییەکان شارەزوور و بانە داگیر دەکەن.
**١٥٥٩/٩/٧**: عوسمانییەکان میری سۆران (میر سەیفەدین) لەسێدارە دەدەن.

**١٥٨٠**: تەیموورخان، بە هاوکاریی عوسمانییەکان میرنشینی ئەردەڵانی گرتە دەست

**١٥٩٠/٣/٢١**: لوڕستان و شارەزوور، بەپێی پەیمانێک لەنێوان صەفەوی و عوسمانیدا لە ئەستەمبۆڵ، کەوتە دەست عوسمانییەکان.

## سالانی ١٦٠٠

؟ **١٦٢٠**: کتێبە ڕێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی (صرف و بعضی اصول لازمە یی تعلیمە بزمانی کورمانجیە) کە بریتیە لە ڕێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی (دیالێکتی گرمانجیی باکوور)، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا (١٦٠٠) نووسراوە. بەڵام مەلا مەحموودی بایەزیدی ئەم کتێبەی سەرلەنوێ لە ساڵی ١٨٥٧دا نووسیوەتەوە.

### ١٦١٤

پیەترۆ دیللا ڤاللا، ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی لە ١٦١٤ لە بەگی دووەم، ل ٨ چاپی ئیتالی باسی کوردستان و زمانی کوردی و ئێگزەنەفۆن و سەلاحەدینی ئەییووبی دەکا. لە باسی زمانی کوردیدا دەڵێ: "کوردەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و زمانەکەیان لە زمانی دراوسێ عەرەب و عەجەمەکانیان ناچێ".

### ١٦٦٥

چەند تێکستێکی زۆر کورت بە زمانی کوردی لە کتێبی سەفەرنامەکەی ئەولیا چەلەبی دا

### ١٦٠٠-١٨٠٠

لە ناوچەی هەورامان کە بەشێک بووە لە میرنشینی سەربەخۆی ئەردەڵان، مەڵبەندێکی ئەدەبی دروست ببوو بە دیالێکتی گۆرانی دەیاننووسی. مێجەرسۆن تەنیا پێنج شاعیری بە نموونە هێناوەتەوە: شێخ ئەحمەدی تەختی، مەلا تاهیری هەورامانی، محەمەد قولی سلێمان، مەحزوونی و فەرخی پاڵەنگانی. هەروەها: یووسف ئیسحاق کە لە ١٦٣٦دا کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵ مستەفا بێسارانی. شیعرەکانیان لیریکای خۆشەویستی و سروشتن، کێشی سیلابین بە قافیەی مەسنەوی.

**١٦٠٣**: هەڵگیرسانەوەی جەنگی نێوان صەفەوی و عوسمانی لەسەر دابەشکردنی کوردستان. شاعەبباسی صەفەوی هێرشێک دەکاتە سەر کوردستانی تورکیا کە لە ١٦٠٥/٨/٢٤دا سەردەکەوێت.

٥/١٢/ **١٦٠٨**: شەڕی قەڵای دمدم لەنێوان خانی لەپزێڕێن و شا عەباسی صەفەویی ئێران. دووای مانگێک بەرگری قەڵای دمدم دەگیرێ. لە هەمان ساڵیشدا فەرمانڕەوایەتیی کوردیی ناوچەی برادۆست دەگیرێت. ناوچەی موکریان، لەلایەن شاعەبباسەوە، دەدرێتە (شێربەگ)، کوردێکی داردەستی شاعەبباس.

**١٦١٢**: سنە تاکو ١٨٦٧ بووە پێتەختی ئەردەڵانەکان.

**١٦٣٢**: ژان باپتیست تاڤێرنیێ TAVERNIER کوردناسێکی فەرەنسییە و لە ١٦٣٢ هاتۆتە کوردستان. سەفەرنامەکەی بە ناونیشانی Les six voyages en Perse، لە ساڵی ١٦٧٦ لە سویسرا چاپکراوە. زیاتر لە هەشتا لاپەڕەی تەرخان کردووە بۆ کوردستانی سالانی ١٦٣٠. لە ب ٢، ل ٢٨، دەڵێ:

«ئەو وڵاتەی لە هەموو وڵاتێکی دیکە بە هێزتر و سەرنجڕاکێشترە. لەبەر ئەوەی نە سەر بۆ سوڵتانی عوسمانی دادەنوێنێ. نە پاشای فارسەکانیش بە هیچ دەزانێ. ئەمە لەکاتێکدا هەموو میرەکانی دیکە، سەر بە یەکێک لەم دووانەن».

**١٦٤٣- ١٧٠١**: بێسارانی

**١٦٥٠- ١٧٠٧**: ئەحمەدی خانی: مەم و زین؛ سەرهەڵدانی بیری کوردایەتی لە ئەدەبیاتی کوردیدا.

خانی لەوە گەیشتبوو کە گەشەسەندنی کولتوور، بەوە دەبێت بە کوردی بنووسرێت، بۆیە دەستی کرد بە گوتنەوەی دەرسی کوردی لە حوجرەکەیدا. هەروەها لە ساڵی (٨٢-١٦٨٣) فەرهەنگێکی عەرەبی ـ کوردی دانا بۆ منداڵان بە ناوی (نۆبار) کە دەبێتە یەکەمین قامووس لە مێژووی کورددا.

**١٦٥٤-١٦٥٥**: سووتاندن و تاڵانکردنی تابلۆ و بەرهەمە هونەری و ئەدەبییەکانی عەبدال خانی هونەرمەند، کوڕی ضیائوددینی کوڕی شەرەفخان ((٧٦ کتێبی دانراو) لەلایەن مەلیک ئەحمەد پاشای دڕندەی تورک، والیی (وان).

**١٦٣٩**: بەپێی پەیمانێک لەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی صەفەویدا، ئێران شارەزووری لەدەستچوو. میرنشینی ئەردەڵانیش تەنیا ئەودیو زاگرۆسی بۆ مایەوە: بووە موڵکی بابان.

**١٦٥٥**: سوڵتانی عوسمانی، مەلیک ئەحمەد پاشای دڕندەی تورک، والیی (وان)، دەنێرێتە سەر میرنشینی بەتلیس و وێرانی دەکا: سووتاندن و تاڵانکردنی ماڵەمیر، ئنجا شار و دێهاتەکان دەخاتەوە ژێردەستی عەسکەری تورک.

**١٦٦٩**: قەڵاچواڵان بووە پایتەختی میرنشینی بابان و لە سەردەمی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە (١٦٨٦) گەیشتە ئەوپەڕی هێزی خۆی



المؤرخ الكردي المعروف الامير شرفخان البدليسي
(القرن السادس عشر الميلادي)

## ساڵانی ١٧٠٠

لە سەردەمی ئەردەڵاتەکاندا دەرەتانێکی باش بۆ گەشەکردنی هونەری کوردی بەتایبەت شیعر خوڵقابوو کە تا کۆتایی سەدەی هەژدەمیش درێژەی کێشا.

سروشتی شیعرپەروەریی ناوچەکە و لاساییکردنەوەی خانانی ئەردەڵان لە " دەربار " ی شایانی ئێران بۆ نازپێدانی شاعیران، دوو هۆی سەرکی بوون بۆ برەوپێدانی ئەدەبی کوردی لە ناوچەی ئەردەڵاندا.

ئەدەبی ناوچەکە بەگشتی شوێنی زۆری ئەدەبی فارسیی لەسەر بوو. بەشێک لە شاعیران بە فارسی شیعریان دەگوت (مەستوورە، ئەفسەر، رەونەق) بەشێکی تریش بەرهەمی فارسییان وەردەگێڕایە سەر کوردی ( خانای قوبادی، میرزا شەفیعی کەندۆڵەیی، ئەڵماس خانی کەندۆڵەیی). وەرگێڕاوەکان هەرچەند لە چوارچێوەی دەقە بێگانەکاندا قەتیس دەمانەوە، بەڵام رەنگ و بۆنی ژیانی کوردەواری و زمانی کوردییان دەدا. یەک لەو تەرجەمانە خوسرەو و شیرینی نیزامی گەنجەوییە کە لەگەڵ چەند بەرهەمێکی دیکەیشی، لەلایەن خانای قوبادی یەوە کراون.

## ١٧١١

– پەندی کوردی بە ئەلفابێی ئەرمەنی

– د. کەمال مەزهەر، لەبارەی دەسنووسە کوردی بە ئەلفابێ ئەرمەنییەکانی ئارشیفخانەی شاری ماتێنەدەرانەوە لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا دەڵێ کە لەوێدا " ئینجیلێکی دەسنووس بە زمانی کوردی و بە پیتی ئەرمەنی هەیە کە دوور نیە لە سەدەی هەژدەدا نووسرابێتەوە "

**١٧٠٤ – ١٧٧٨**: خانای قوبادی
**١٧٤٥ – ١٨٠١**: وەلی دێوانە
**١٧٥٠ – ١٨٠٩**: رەنجووری، بە دیالێکتی گۆران شیعری نووسیوە. یەکەم کوردە کرۆنۆلۆژیای کوردستانی نووسیبێتەوە، بە فارسی (سالنامە).

## ساڵانی ١٧٠٠

عوسمانییەکان عیراقیان دابەش کردبووە سەر سێ ویلایەت: مووسڵ و بەغدا بەسرە. هەر ویلایەتێک والییەکی هەبوو. دومینیک لانزا دەڵێ: دانان و لابردنی هەر والییەک بەدەست سوڵتانەوە بووە. هەر الییەکی هاتبێتە موووسڵێش خەڵکی مووسڵ نەبووە، ئەوەندەش دەسەڵاتی بەسەر ویلایەتی مووسڵەوە نەبووە.

## ١٧٠١

قوباد پاشای میرنشینی بادینان (لە ئامێدی)

## ١٧٢٦

فەرهاد پاشا میری بابانە؛ بارام پاشا میری بادینانە.

## ٩ی ئازاری ١٧٣٦

نادرشا حوکمرانیی ئێرانی گرتە دەست و کردستانی ئێرانی داگیرکرد. ئیتر لە ١٧٣٦ تا ١٧٤٧ خەریکی راگواستنەوەی زۆرەملێی کورد دەبێت بەرەو خۆرهەڵاتی ئێران.

ناوەڕاستی ساڵانی **١٧٠٠**: کاتێ کەریم خانی زەند فەرمانڕەوای ئێرانە؛ شەڕوشۆڕ لەنێوان بابان و ئەردەڵان پەیدا دەبێ.

**١٧٥٢**: خەسرەوخانی ئەردەڵانی مل بۆ سەلیم پاشای بابان کەچ دەکا. لە ١٧٦٣ سلێمان پاشا (کە لە ١٧٤٧ بۆتە میری بابان) هێرش دەکاتە سەر ئەردەڵان و دەشکێ.

## ٧١– ١٧٧٣

بێ بارانی و تاعوون و قات و قڕییە ناوادارەکەی کوردستان

**١٧٥٣ -١٨٣٧**: شـێخ مـەعـرووفی نۆدێ، باوکی بردوویەتیـە قـەڵاچوالانی بابانەکـان. ئنجـا لە سلێـمـانـی دەیان قــوتابیی پێگەیاندووە. مــاوەی ١٧٥٨- ١٨٢٢ بە سەردەمی زێڕینی مزگەوتی گەورە دادەنرێ، چونکە لەوکاتەدا لەوێ دەرسی گوتۆتەوە.

**١٧٥٦ -١٨٢٥**: پرتەو بەگی هەکاری
**١٧٥٨**: حارسی بەتلیسی
**١٧٧٢ -١٨٣٢**: مرادخانی بایەزیدی

## ساڵانی ١٧٦٠

مـەلا مـحـمـدی سـێـوچی (؟ - ١٧٧٦): تذکـرە الاعوام (بەیتی ئەووەڵ و ئاخر)، بە کوردی، پەخشـان و شـیـعـرە (٤٠) لاپەڕەیە. محـمـد علی قـرداغی چاپی کردۆتەوە: چاپخانەی کامەران، سلێمانی: ١٩٧٩.

**١٧٨٤**: کـتـێـبـخـانەی مـەلا عـەلی صەحـحـاف لەلایەن مـەلا براهیمی قـولەڕەشـیـیەوە: کـتـێب فـرۆشتن و بەرگ تێگرتن و چاککردن و نووسینەوە.

**١٧٨٧**: یەکەمین قامـووسی ئەورووپی - کـوردی، نووسـراوی قـەشـەی ئیـتـاڵی، گـارزۆنی، کـە لە ڕۆمـا چاپکراوە؛ چەند کورتە تێکستێک بە زمانی کوردی.

**١٧٨٩ -١٨٨٥**: کاک ئەحمەدی شێخی کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدێ.
**١٧٩٠**: ابن ادم بە زمـانی کـوردی پێـشـەکی بۆ کتێبە ئەستێرەناسییەکەی (مشکاە المنقول) دەنووسێ

**١٧٩٣ ـ ١٨٧٦**: ئەحمەدبەگی کۆماسی
**١٧٩٧ -١٨٥٥**: نالی
**١٧٩٧ -١٧٩٨**: نووسـەرێک بە نـاوی (مـەلا مەحمود ) بە دیالێکتی کرمانجی کتێبێک لەبارەی پزیشکی بە ناوی (طوبـا کـوردی) دەنووسـێت. لە گەنجینەی م. عبداارقیب یووسف پارێزراوە

**١٧٧٩**: مەحموود پاشای باوکی ئەوڕەحمان پاشا دەبێتە میری بابان

**١٧٨٤ -٨٣**: دامـەزرانی سلێـمـانی لەلایەن ئیبـراهیم پاشای بابانەوە لە سەردەمی دوواپین ساڵی فەرمانڕەوایەتیی باوکییەوە، سلێمان پاشا.

**١٧٨٤ ـ ئابی١٨٣٦**: میـرنشینی سۆران، پایتـەختەکەی لە ڕواندز بووە. پاشای کۆرە لە چارەگی یەکەمی سەدەی ١٩مدا فەرمانڕەوا بووە.

**١٧٩٤**: قـاجارییـەکـان دەسـەڵات لە کـەریمخـانی زەند دەسـێننەوە و دەبنە فـەرمـانڕەوای ئێـران: فـەتح عەلی شا.
- ئەوڕەحمـان پاشای بابان چیای سنجاری گرت و گەیشتە ئورفە.

**١٧٩٩**: ئەوڕەحـمـان پاشـای بابان بە فـەرمـانی بەغدا کرا بە حاکمی حەری و کۆیە، دوواتر بۆ حیللە دوورخـرایەوە. پاشـان رایکرد بۆ لای ئەمـانوڵڵا خـانی ئەردەڵان. سلێمان پاشای بابانیش دەکوژرێ.


کەریمخانی زەند



«کـورد لە نامـە گـۆڕینەوەی نێـو خـۆیاندا زمـانی فارسی بەکاردێنن».

پ. لێرخ

ڕۆژهەلاتناسی ڕووس سەدەی ١٩م

«دنێڤ ئەکـراداندا مـەکـتـووب و کـاغـەزێد وان فـارسی العبـارە دبن. خـووندنا ترکی و زمـانی ترکی کێم دزانن. کتێبێد زمانی ترکی لنک وان موعتەبەر نینن».

مەلا مەحموودی بایەزیدی ١٨٥٨

د. کـەمـال فـوئاد لە کـەتەلۆگی دەسنووسـە کـوردییـەکـانی پارێزراو لە لە کتێبخانەی بەرلین باسی دوو نوسخەی خوسرەو و شیرین ٠ ٢٠ و ٨٨) و سێ نوسخەی شیرین و فەرهاد ( ٢ و ٢٠ و ٨٩) دەکات و بە هۆنراوەی ئەلماس خانی کەندۆلەیی و میرزا شەفیعی کەندۆلەیی ناویان دەبات.

ئەم وێنەیەی سەرەوە، لاپەڕەی کتێبی خورشید و خاوەرە، کە لە سەدەی ١٧م نووسراوە و بە نیگار ڕازێندراوەتەوە.

Kamal FUAD: Kurdische Handschriften, Weisbaden: 1970.

١٨٠٠- ١٨٦٦: سالم
١٨٠٠ ـ ١٨٤٤: مەستوورە خانمی ئەردەڵانی (ماە شەرەفخانم)، جگە لەوەی شیعری بە کوردی و فارسی نووسیوە، بە یەکەمین ژن دەژمێردرێت لە هەموو ڕۆژهەڵاتدا کە مێژووی نووسیبێتەوە: «تاریخی ئەردەڵان».

١٨٠٦- ١٨٨٢: مەولەوی
١٨٠٦- ١٨٧٦: مەلای جەباری
١٨٠٨- ١٨٨١: سەی یاقۆ
١٨٠٩- ١٨٤٩: کوردی
١٨١٤ ـ ١٨٨٣: کەیفی
١٨١٥- ١٨٩٧: حاجی قادری کۆیی

**١٨١٩:** «عەقیدەنامەی کوردی» مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ـ ١٨٢٧)، وەریگێڕاوەتە سەر کوردی و لە ١٨٧٧دا ـ نزیکەی نیو سەدە دووای کۆچی دووایی خۆی ـ بە دەستی مەلایەک سەرلەنوێ نووسراوەتەوە، بەڵام کۆنترین دەسنووسی ئەم تێکستە لای م. کەمال ڕەئووف پارێزراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨١٩. تێکستەکە پێنج فەرزەکەی دینی ئیسلام بە زمانی کوردی دەخاتە ڕوو.

١٨٣٠- ١٩٠٤: مەحوی
١٨٣٥- ١٩٠٩: شێخ ڕەزای تاڵەبانی

١٨٤٠ ـ ١٨٦٠مەدرەسەی قوبەهان: ئامێدی.
**١٨٤٣:** کتێبی سەرەنجام ی ئەهلی حەق

**١٨٤٤:** یەکەمین چاپکراوی کلاسیک، دیوانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، ئەستەمبۆڵ: ١١٠ ل.

١٨٤٤- ١٩١٤: وەفایی
١٨٤٥ ـ ١٩٠٩ : سالمی سنەیی
١٨٤٩ ـ ١٩٢٥ : مەجدی

**١٨٠٢:** ئەوڕەحمان پاشای بابان دەسەڵاتی بابانی گرتە دەست . ئامانجی: رزگارکردنی کوردستان بوو لەدەست عوسمانییەکان و قاجارییەکانی ئێران. لە چارەگی یەکەمی ئەو سەدەیەدا زنجیرەیەک شەڕ و پەلاماری لە هەر دوو لاوە دەکرێتە سەر.

**١٨١٢:** بەدرخان پاشا دەسەڵاتی میرنشینی بۆتان لە جەزیرە دەگرێتە دەست

**١٨٢٠/٤/١:** مستەر ڕیچ دەگاتە کوردستان: باس و خواسەکانی شاری سلێمانی.

**١٨٢٥:** کۆچی دووایی عوسمان پاشای بابان؛ تێکچوونی قەڵاچواڵان.

**١٨٢٨ ـ ١٨٢٩:** جەنگی تورکیا ـ رووسیا

**١٨٣٧:** رووخانی فەرمانڕەوای بادینان بەدەست عوسمانیەکان
- هێرشی تورک بۆ سەر میرنشینی بۆتان
- کوژرانی پاشای گەورە لە ئەستەمبۆڵ بەدەست تورکەوە

**١٨٤١:** بەدرخان پاشا، لە مەڵبەندی جزیرە و بۆتان جاڕی سەربەخۆیی کوردستان دەدا: لە ١٨٤٢ ئاڵا و دراوی خۆیشی دادەمەزرێنێ

**١٨٤٧/٥/١٩:** پەیمانی ئەرزەڕۆم لەنێوان عوسمانی و فارسەکاندا: دابەشکردنێکی نوێی کوردستان بەسەر خۆیاندا. مانگێک دووای ئەوە لەشکری عوسمانی هێرشی کردە سەر میرنشینی بەدرخان و لە ١٨٤٧/٧/٢٧ میر بەدرخان دەسگیر کرا و نەفی کرایە دورگەی (کریت) و پاشان لە ١٨٦٨ لە (رکن الدين) لە دیمەشق سەری نایەوە.

**١٨٥١ ـ ١٩٠٧**: حەریق
**١٨٥٣ - ١٩١٧**: مەلا حەمدوون

## ١٨٥٤

- حاجی قادری کۆیی لەگەڵ کەیفی جوانڕۆیی چۆتە ئەستەمبۆڵ. ناوبراو، لەدووای نالی، یەکەمین شاعیری کوردە لە مێژوودا دەکەوێتە ناو کەشوهەوای ڕۆشنبیریی تورک و ڕۆژئاوایی؛ چەمکە ئەورووپاییەکان لەبارەی کۆمەڵ و ئازادی و سەربەخۆیی وڵات کاریان تێدەکات.
- شێخ ڕەزا لە ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا ماوەیەکی ژیانی لە ئەستەمبۆڵ بەسەربردووە.

**١٨٥٦ - ١٨٦٦**: مەلا مەحموودی بایەزیدی (١٧٩٩؟- ١٨٦٠) کۆمەڵێک چیرۆک و تێکست و کتێبی مێژوویی (بە دیالێکتی کرمانجیی باکوور) دەنووسێت، کە بە هاوکاریی ئەلکزەندەر ژابای کونسوڵی ڕووسیا لە ئەرزەڕۆم خراونەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەرەنسی کراون: مەم و زین (١٨٥٦) کە دەبێتە یەکەم چیرۆکی بڵاوکراوەی کوردی؛ لەیلا و مەجنوون (١٨٥٩)؛ سیابەند و شەمسێ (١٨٦٠)؛ کیتابی مەولوودی شەریف (١٨٥٨)؛ تەواریخی جدیدی کوردستان (١٨٥٧)؛ صفحە صبیان کە بریتیە لە کتێبی ئەلف و بێی زمانی کوردی بۆ منداڵان،؛ رسالە تحفە النحلان فی الزمان کردان لەبارەی ڕێزمانی کوردی (١٨٦٦)؛ جامع یی رسالیان و حکایتان، چل چیرۆکی کوردییە، کە دەبێتە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بە کتێب (١٨٦٠)؛ تەواریخی قەدیمی کوردستان (١٨٥٨ـ ١٨٥٩)؛ عادات و ڕسووماتنامەی ئەکرادیە؛ هەروەها کتێبە ڕێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی (صرف و بعضی اصول لازمە یی تعلیمە بزمانی کورمانجیە) کە بریتیە لە ڕێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا نووسراوە. بەڵام بایەزیدی ئەم کتێبەی سەرلەنوێ لە ١٨٥٧دا نووسیوەتەوە.

## ١٨٥١

ڕووخاندنی میرنشینی بابان بەدەستی تورکە عوسمانییەکانەوە کە دووا میریان عبدالله پاشا بوو

## ١٨٥٥ -٥٣

ڕاپەڕینەکانی یەزدان شێر لە ناوچەکانی هەکاری، کە لە ١٨٥٥ توانییان مووسڵیش ئازاد بکەن؛ لە ١٨٥٥ بەغدای عوسمانی سوپایەکی کۆکردەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان. ژمارەی چەکدارەکانی یەزدان شێر (٦٠٠٠٠) کەس بوون.


1861

**١٨٥٦ :** وەرگـــێـــڕانێکی پەخـــشـــانیی ئەسکەندەرنامەی نیزامی گەنجەوی کە (شەهنەزەر) ناوێک لە ئەرزەڕۆم کردوویەتیە کرمانجیی باکوور.

**١٨٥٧**

– وەرگـێـڕانی ئینجـیل لە زمـانی یۆنانیـیـەوە بۆ کوردی (کرمانجیی باکوور) بە ئەلفابێی ئەرمەنی، لە ئەسـتـەمـبـۆڵ، لەلایەن مـسـیـۆنێـرەکـانەوە. (٣٩٨ لاپەڕەیە).

– ئەحمەد خانی چوارەمین پاشای میرنشینی بابان لە سـاڵی ١٨٥٣ سـەری لە پاریس داوە و مـیـوانی ڕۆژهەڵاتناس، خـۆدزکـۆ CHODZKO بووە. چەند باسـێکی زمـانەوانی و چەند چیـرۆکـێکی بە زمـانی کوردی بۆ خۆدزکۆ نووسـیوە و لە سـاڵی ١٨٥٧دا لە شێوەی نامیلکەیەکدا بڵاوکراونەتەوە.

**١٨٥٨**

سلێـمـان بەگی قـەوواس توانیـویەتی یەکـەم قوتابخانەی ڕوشدیەی موڵکی لە سلێمانی بکاتەوە کە چوار پۆلی تێدا بووە. ئەم قـوتابخـانەیە، بەپێی سـاڵنامـەی ویلایەتی مـووسڵ، لە سـاڵی ١٨٨٣دا ژمارەی قوتابییەکانی ١٠٣ قوتابی بووە، بەڕێوەبەر: حاجی عـبدالفـتـاح ئەفەندی بووە و سێ مامۆسـتـای هەبووە. پیـرەمـێـردی شـاعـیـر لەم قـوتابخـانەیەدا خوێندوویەتی.

**١٨٥٩– ١٩١٦** : مصباح الديوان ئەدەب



وێنەی سەرەوە: پاشای کۆرە
وێنەی خوارەوە: میر بەدرخان



## سالانی ١٨٦٠

وەرگێرانی مەولوودنامەیەک لە زمانی عەرەبییەوە، لەلایەن شێخ حسێنی قازی (١٧٩١ـ ١٨٧٠)، بۆ دیالێکتی کرمانجیی خواروو لە سالانی ١٨٦٠دا کراوە. بەرهەمەکە بە شیعر و پەخشان ژیاننامەی پێغەمبەر لە شێوەی مەولوودنامەدا دەگێرێتەوە.

**١٨٦١:** کتێبی (ئەلفا بێ جێ یا کورمانجی و ئەرمەنی): ئەستەمبۆڵ، لەلایەن دەستەیەک مسیۆنێر و نووسەری نەناسراو بە ئەلفابێی ئەرمەنی بەلام بە زمانی کوردی (کرمانجی) بلاوکراوەتەوە.ئەم کتێبە، باسی مێژووی مەسیحیەتە، زیاتر لە (٣٥) نیگاری تێدایە.

**١٨٦٣ ـ ١٩٤١:** حاجی محەمەد عەلی، ناسراو بە سابیر، زیاتر لە نیو سەدە خۆشنووسیی کردووە و خزمەتی ئەم هونەرەی کردووە. تا ئێستاش لە گەلێک شوێنی بەغدا پاشماوەی بەرهەمەکانی ماوە.

**١٨٦٤ ـ ١٨٦٩:** محەمەد ئەمین یمنی (مەلا ئەمین)، کۆییە، لە بەغدا ژیاوە، خۆشنووس بووە. یەکەم کەسە مۆری لە عیراقدا بلاوکردەوە.

**١٨٦٥ـ ١٩٣٢:** مستەفا شەوقی قازی زادە
**١٨٦٧ ـ ١٩٥٠:** پیرەمێرد
**١٨٧٠ـ ١٩٣٨:** میرزا غەفوور
**١٨٧٣ـ ١٩٤٢:** صافی
**١٨٧٣ـ ١٩٤٦:** مەلا مارفی کۆکەیی
**١٨٧٤ـ ١٩٣٢:** ئەدیب
**١٨٧٤ ـ ١٩٤٤:** ناری
**١٨٧٥ ـ ١٩١٧:** تاهیربەگی جاف
**١٨٧٥ـ ١٩٢٨:** خالیسی
**١٨٧٥ ـ ١٩٤٨:** زێوەر
**١٨٧٦ ـ ١٩٣٦:** حەمدی
**١٨٧٦ـ ١٩٤٣:** مەلا محەممەدی کۆیی



دوو میناتۆری کوردستانی تورکیا (زننامە: سەدەی ١٨م)



**١٨٧٦ :** له شاری هەولێر، یەکەم قوتابخانەی فەرمی کراوەتەوە. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە مەلا رەئووفی خدر ئەفەندی بووە، یەکێک لە مامۆستایانی قوتابخانەکە ناوی خدره فەندی بووە. لە ساڵی ١٨٩٤دا ژمارەی قوتابییانی: ( ٣٦ ) قوتابی بووە.

**١٨٧٧ :** «عەقیدەنامەی کوردی» مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ـ ١٨٢٧)، وەریگێڕاوەتە سەر کوردی و لە ١٨٧٧دا ـ نزیکەی نیو سەدە دووای کۆچی دووایی خۆی ـ بە دەستی مەلایەک سەرلەنوێ نووسراوەتەوە کۆنترین دەسنووسی ئەم تێکستە لای م. کەمال رەئووف پارێزراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ١٨١٩.

– شانۆنامەنووس، مەدحەت ئەحمەد ئەفەندی ١٨٤٤ ـ ١٩١٢، شانۆنامەیەکی بە زمانی تورکی بە ناونیشانی کورد قزی (کچە کورد) لەبارەی ژیانی کوردەکانی کوردستانی تورکیا نووسیوە و لە شاری ئەستەمبۆڵ لەسەر شانۆ پیشانی خەڵک دراوە.

**١٨٧٨– ١٩٦٧ :** عەبدولڕەحمان بەگی نفووسی
**١٨٨٢– ١٩٤٤ :** سابیری
**١٨٨٢– ١٩٢٦ :** شوکری فەزڵی

**١٨٨٥– ١٩٥٨ :** مەعرووف عەلی جیاوک، کە لە ١٩٠٢ دەچێتە ئەستەمبۆڵ و حقووق تەواو دەکا و لە ١٩٠٨ دێتەوە.

**١٨٨٦– ١٩٧٤ :** کەماڵی (عەلی باپیر ئاغا)

**١٨٨٧**

– ئەلبێرت سۆسین بە هاوبەشیی ی. پریم، دوو بەرگ کتێبیان بە ناوی کەشکۆڵی کوردی لە ماوەی ٨٧ ـ ١٨٩٠دا لە سانت پیترسبۆرگ بڵاوکردۆتەوە، گەلێ چیرۆکی فۆلکلۆری و داستانی کوردی بە وەرگێڕانی ئەڵمانییەوە تێدایە. پاشان پێکەوە لە ١٨٩٨ ـ

**١٨٧٨– ١٨٨٢**

–ڕاپەڕینەکانی شێخ عەبیدوللەی نەهری (شەمزینی) و نامەکانی بۆ کونسوڵی ئەمریکی و ئینگلیز لەپێناو سەربەخۆیی کوردستاندا کە لە ١٨٨٠دا دەگاتە بزاڤی چەکداری و زیاتر لە (٠٠٠ ٥٥) چەکداری هەبوو. دژی ئێران و عوسمانییەکان دەجەنگین. تا لە ئۆکتۆبەری ١٨٨٢ شێخ عبیدالله لە هەکاری بەدیل گیرا و نەفی کرایە ئەسکەندەروونە و ئنجا مەککە. مانگێک دووای ئەوە شێخ عبیدالقادری کوڕیشیان گرت و شۆڕشەکەیان کۆتایی هات.

– ڕاپەڕینی نەوەکانی بەدرخان پاشا کە لە ئەنجامدا جەزیرە و بۆتانیان خستەوە ژێر دەستی خۆیان

**١٨٨٩/٥/٢١**

دامەزراندنی یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی لەلایەن کوردەوە: ڕێکخراوی اتحاد و ترقی لە ئەستەمبۆڵ لەلایەن دوو ڕووناکبیری کوردەوە (د. عبدالله جەودەت و ئیسحاق سکووتی) کە دوو ڕووناکبیری ئەرمەن و چەرکەسیشیان لەگەڵدا بوو: لەپێناو رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دامەزراندنی سیستەمێکی پەرلەمانتاری و دیموکراسی. ئەم گرووپە لەکۆتاییدا ناویان لێنرا (تورکە گەنجەکان) کە لە ١٩٠٨ حوکمیان گرتە دەست.

١٩٠١ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییان لەسەر ئەم تێکستانە بڵاوکردۆتەوە.

– کوردناسی ناوداری فەرەنسی (هینری بیندەر) لە ساڵی (١٨٨٧)دا، پاشان (لۆکۆنت دوشۆلێت) لە ساڵی (١٨٩٢)دا، بۆ یەکەمین جار کامێرای فۆتۆیان هێناوەتە کوردستان ؛ ژیانی کوردستانیان خستۆتە نێو چوارچێوەی فۆتۆگرافەوە.

**١٨٨٨ :** زمانی کوردی لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ناوچەکانی نێوان سنووری کوردستانی تورکیا – عێراق، بە ئەلفابێ و خەتی سریانی (کرشونی) نووسراوە. نموونەی یەکەم: رێزمانی کلدانی (سریانی / رۆژهەلاتی) ـ کوردی، لەگەڵ تەرجەمەی چەند بەشێکی پەیمانی نوێ؛ وێرای چەند پەندێک، بە ئەلفابێی کلدانی (سریانی / رۆژهەلاتی). قەبارەکەی: ٢٣ بە ١٦ سم، حەڤدە پەڕاوە، هەر پەڕاوێکی ١٩ دێڕە. لە ١٨ی ئابی ١٨٨٨ لە ئەرادن لەلایەن ئێلیا هەمۆ ئەلئەلقوشی نوسراوەتەوە. دووەمیان: رێزمانی کوردی و تەرجەمەی چەند بەشێکی ئینجیل و چەند نامەیەکی مار پۆلس، لەگەڵ قاموسێک، نووسرای: قەشە ئەبلحەد (هەردووکیان ٧ پەڕاون). قەشە ئەلشەمماس ئێلیا هەمۆ ئەلئەلقوشی نووسییەتییەوە.

**١٨٩٠–١٩٥٨ :** عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری
**١٨٩٠ ـ ١٩٦٣ :** ئەحمەد موخلیس ( نالبەند)
**١٨٩٠ ـ١٩٦٢ :** عەبدولخالق ئەسیری
**١٨٩١ ـ ١٩٨٢ :** حامید ئامێدی (مووسا عەزمی دیاربەکری)، خۆشنووسێکی هونەرمەند بووە.

**١٨٩٢– ١٩٥٩ :** شێخ سەلامی شاعیر
**١٨٩٢ :** تورکەکان بۆ چاوترساندنی کورد قوتابخانەی (عەشرەت مەکتەبی) لە ئەستەمبوڵ دادەخەن کە منداڵانی گەورەپیاوانی کورد تێیدا دەیانخوێند.





وێنەی سەرەوە: عەقیدەنامەی کوردی (١٨١٩)
وێنەی خوارەوە: طوبیا کوردی (١٧٩٧)

**١٨٩٣ :** فەرهەنگەکەی یوسف ضیاء الدین باشا الخالدی المقدسی : الهدیه الحمیدیه فی اللغه الکردیه لە ئەستەمبۆڵ، لەگەڵیدا فەرهەنگی نۆباری ئەحمەدی خانی کە لە ١٦٨٢ ـ ١٦٨٣ بۆ منداڵان نووسراوە.

**٩٣- ١٨٩٤ :** بە کۆششی سەرۆک شووراى دەوڵەتی عوسمانی، سەعید پاشای کوڕی سلێمان بەگی خەندان، واتە باوکی ژەنەراڵ شەریف پاشا، لە سلێمانی، قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری کرایەوە. دەرچووانی چوونەتە بەغدا و ئەستەمبۆڵ. ئەمین زەکی بەگ و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و مەعرووف جیاوک و ئەمین رواندزی و دەیانی دیکە.. دەرچووانی ئەم قوتابخانەیەن. سەعید صدقی حەسەن کابان لە ١٩٠٣ بۆتە مامۆستا لەوێ.

**١٨٩٥ :** بڵاوکردنەوەی کتێبی (مەسحەفا رەش) و (جیلوە)ی یەزیدییەکان لەلایەن مسیۆنێری ئینگلیز، ئۆ. باری. پاشان (براون) وەری دەگێڕێتە سەر ئینگلیزی.

**١٨٩٥ - ١٩٦٦ :** مامەند کەرکووکی
**١٨٩٥- ١٩٧٨ :** کامەران بەدرخان

**١٨٩٦ :** ئەمین فەیزی: نووسینی «ئەنجوومەنی ئەدیبان» ، کتێبێکی گرنگی پەخشان و وتار و رەخنە.

**١٨٩٦- ١٩٥٠ :** مستەفا شەوقی قازی زادە
**١٨٩٦- ١٩٥٨ :** شێخ نووری شێخ ساڵح

**١٨٩٧ :** حاجی قادری کۆیی کۆچی دوایی دەکات و پیرەمێرد دەگاتە ئەستەمبۆڵ؛ لەوکاتەدا ئەدەبی تورکی خەریکە هەنگاودەنێ بەرەو خۆ تازەکردنەوە.

**١٨٩٧ـ١٩٣٥ :** ئەحمەد موختاربەگی جاف

حەریق لەبارەی قوتابخانەی روشدییەوە دەڵێ:

ئەم تاقمە شیرینە لە مەکتەب کە دیارن
جەللادی دڵی عالەم و ئاشووبی دیارن

رەشید زەکی کابان (١٨٦٧ ـ ١٩٤٠) کە خۆی دەرچووی قوتابخانەی روشدیەی سلێمانی بووە، پاش تەواوکردنی ئێعدادی عەسکەری لە بەغدا و دانشگای سوپایی لە ئەستەمبووڵ، بۆتە مودیر.

ئەمین فەیزی، کە لە کۆتایی سەدەی ١٩مدا لە ئەستەمبۆڵ کۆلۆنێل بووە، لە «ئەنجوومەنی ئەدیبان»دا کە یەکەمین ئەنتۆلۆژیا و کتێبی رەخنەی شیعرییە. لەبارەی نالی یەوە دەڵێ:
«زەکای نالی ئینکار ناکری، لاکین ئەوەندەی صەنایعی لەفطیەی ئیستیعمال کردووە، پیاو رەنگە بڵێ: شیعری ئەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە».

لەبارەی مەولەوی دەڵێ: «مەسلەکی مەولەوی مەسلەکی زوهد و تەقوایە، لەگەڵ ئەوەش شاعرێک بووە بێ نەزیر. مەولەوی هیچ چاوی بە شیعری فەرەنگ نەکەوتووە، لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئوسلووبی ئەوان شیعری نەظم کردووە. ئەم ئوصووڵە خیلافی ئوصووڵی شوعەرای ئێرانە. لە مابەینی شوعەرای کوردا مەولەوی موقابل بە نیظامی یە.

دەروازەی سێیەم

# کرۆنۆلۆژیای کوردستان
# ١٨٩٨- ١٩٣٢



**جەلادەت و سورەییا و کامەران بەدرخان**

# ژیانی کولتووری
## ۱۸۹۸- ۱۹۳۲

### ۲۲ی نیسانی ۱۸۹۸

– میقداد مەدحەت بەدرخان کە یەکێک بوو لە ئەندامەکانی ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی): لە قاهیرە، بڵاوکردنەوەی یەکەم ڕۆژنامە بە زمانی کوردی لە مێژوودا (کوردستان).

– چاپخانەی (کوردستان) لە قاهیرە، لەلایەن میقداد – مەدحەت بەدرخانەوە، کە دەبێتە یەکەمین چاپخانەی کورد و تەنیا دوو ژمارەی ٤ و٥ی ڕۆژنامەی کوردستانی پێ چاپ دەکرێت.

– حاجی قادری کۆیی یەکەم شیعری، لە ساڵی ۱۸۹۸، لە ژمارە (۳)ی ڕۆژنامەی کوردستان بە ناونیشانی (زەمانە) بڵاودەکرێتەوە. پاشان وردە وردە، تا ساڵی ۱۹۲۵، لە (دیاریی کوردستان، تێگەیشتنی ڕاستی، ڕۆژی کورد، هەتاوی کورد، ژین، ژیانەوە) ۱۹ شیعری حاجی بڵاودەکرێنەوە: کاریگەرییان دەبێ بەسەر تازەبوونەوەی شیعری.

### ۱۸۹۷-۱۸۹۹

دوو ڕووناکبیری کورد، د.عەبدوڵڵا جەودەت و د. ئیسحاق سکووتی، کە دامەزرێنی ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوون و لە زیندان و لەدەست زەبروزەنگی سوڵتان عەبدولحەمیددا رایانکردبوو، خۆیان گەیاندبووە ژنێڤ: لەوێ دوو ڕۆژنامەیان بە زمانی عوسمانی دەردەکرد؛ عوسمانلی (۱۸۹۷- ۱۹۰٤). دووەمیان اجتهاد (۱۹۰٤). لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی دیکە بە فەرەنسی Osmanli (۱۸۹۷- ۱۸۹۹) کە پاشکۆی (عوسمانلی) بوو. ئەم دوو ڕۆژنامەیە، کە ساڵێک پێش (کوردستان) بڵاوکراونەتەوە دەبن بە یەکەمین ڕۆژنامە کە کورد بە زمانی بێگانە بلاوی کردبێتەوە. ئەم دوو ڕووناکبیرە

# ژیانی سیاسی
## ۱۸۹۸- ۱۹۳۲

**کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا**
**(گەنجە کوردەکان)**

د. عەبدوڵا جەودەت، دامەزرێنی یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی کە لەلایەن کوردەوە دامەزرابێت لە ساڵی (۱۸۸۹) لە ئەستەمبوڵ، بۆ یەکەمین جار ناو لەم نەسلە کوردە ڕووناکبیرە نوێخوازە دەنێ «کوردە گەنجەکان». ناوبراو بۆ خۆیشی یەکێک بوو لەو وەچە گەنجە گۆڕانخوازە و دامەزرێنی ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوو کە پاشان بووە هۆی درستبوونی (بزاڤی گەنجە تورکەکان).

(گەنجە کوردەکان) ئەو نەوە ڕووناکبیر و نووسەرە نوێخوازە کوردە بوون کە لە کۆتایی سەدەی ۱۹ و سەرەتای سەدەی بیستەمدا سیستەمە مەعریفییە کۆنەکەی کوردستانیان هەڵتەکاند و دەستاوەردی نوێیان بەخشییە وڵاتەکەیان. لە ۲ -۸- ۱۸۹۸ ژنێف، د. عبداللە جەودەت لە شیعرێکیدا بۆ عبدالرحمن بەدرخان دەنووسێ:

ایام ما گذشت بغربت ولی چه غم
اشراق شرق شد اثر اغتراب ما

ئەمە وەرگێڕانە کوردییەکەیەتی بە شیعر:

ڕۆژەکانمان لە غوربەتدا بە هەدەر چوون، بەڵام چ باک
ڕۆژهەڵات سەرتاپا درەوشایەوە بە ئاوارەیی ئێمە

**۱۸۹۸/۷/۹**: ژەنەراڵ شەریف پاشا دەبێتە باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم؛ لەژێرەوەش ئەندامی ڕێکخراوی (ذیتیحاد و تەرەقی)یە دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

لە سـویسـرا، هاوکـاریـیـان هەبوو بۆ ڕۆژنامـەی (کـوردسـتـان) کە عـبـدالرحمن بەدرخانی سەرنووسەر ئەندامی ڕێکخراوەکەی ئەوان بوو.

## ١٨٩٩

– لەسـەر داوای ئەشـرافی سلێـمـانی مـەکـتـەبی ئەعدادی لە سلێمانی کراوەتەوە.

– مەم و زین، بە پەخشـان و شیـعرە، لەگەڵ چەند بەیتـێکی دیکەی کـوردی بە دیالێکتی کـرمـانجی. ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، مارتن هارتمان -Martin HARTIMANN (١٨٥١ ـ ١٩١٩) کۆی کردۆتەوە .

– لەدایکبوونی قانیع (١٨٩٩– ١٩٦٥)

## ١٩٠٠

– زێوەر دەگاتە ئەستەمبۆڵ و چوارساڵ لەناو ژیانی ئەدەبیی ئەوێ بەسـەر دەبات و دەکـەوێتـە ژێر کاریگەرێتیی شاعیرە تورکەکان.

– لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە هەولێر، بەپێی سـجلـلاتی کـۆن، وانەی " لیـسـانی فـەرەنسـەوی و مۆسیـقا و ڕەسم و ئال ئیشلەری و تەربیـەی بەدەنی و حوسنی خەت " دەخوێنزا.

– سـەعـیـد صـدقی حـەسـەن کـابان مـامـۆسـتـای قوتابخانەی نموونەی ئیبتیدائی بوو.

## ١٩٠٢

– وەرگێڕانی «دقائق الاخبار فی ذکر الجنه و النار» دقائق الاخبار، لە عەرەبییەوە بۆ کوردی «هەورامی». دیار نیـە کێ تەرجـەمەی کـردووە. لە ساڵی (١٩٠٢) نووسراوەتەوە. (١٢١)لاپەڕەیە.

– سـاڵح زەکی صـاحب قـران بۆ خـوێندنی سـەربازی چووە ئەستەمبۆڵ

– ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠–١٩٤٨) مـەکـتـەبی ڕوشدی مـەلەکی و پاشان ڕوشدییـەی عـەسکەریی لە سلێـمـانی، ئنجـا ئەعـدادی عـەسکەریی بەغـدای

## ١٩٠٠

عـەزمی قـەوی جەمعـیـەتی لە ئەسـتـەمبۆڵ، فـیکری دیاربەکـری دامەزراند کـە تا ١٩٠٤ بەردەوام بوو. ئەندامە چالاکەکانیان بریتی بوون لە ئەحمەد کوردیزادە و ئەحمەد خاسی زادە.

## ١٩٠٢

کـۆنگرەی یەکـەمی ئیـتـیـحـادییـەکـان لە پـاریس. حکمت بابان و و عـبـدالرحمن بەدرخـان. بەشداریـیان تێدا کرد.



د. عبدالله جەودەت

تەواوکردووە. پاشان لە ١٩٠٢ لە ئەستەمبۆڵ مەکتەبی ئەرکانی حەربی تەواوکرد. بۆ ماوەی ساڵێکیش لە ١٩١٣دا، لەگەڵ چەند زابتێک، نێردرا بۆ خوێندن لە فەرەنسا. لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠دا یەک بەدووای یەک چەندین وەزارەتی گرتۆتە دەست. لە ٣٠ی مایسی ١٩٣٠دا ئەندامی دامەزرێنی یانەی سەرکەوتن بووە لە بەغدا.

- لەدایکبوونی ڕەمزی مەلا مارف (١٩٠٢-١٩٥٧؟)

## ١٩٠٣

- کوردناسی ئەڵمانی لۆکۆک، کتێبێکی دوو بەرگیی، لە بەرلین بڵاوکردۆتەوە کە پڕە لە چیرۆک و تێکستی جۆراوجۆر بە زمانی کوردیی دیالێکتی کرمانجی بە پیتی عەرەبی و لاتینی، بە تەرجومەی ئەڵمانییەوە بڵاوکردۆتەوە. فەرهەنگۆکێکی بۆ وشە گرانەکان کردووە: زازایی ـ کوردیی بابانی ـ ئەڵمانی.
- لەدایکبوونی جگەرخوێن (١٩٠٣- ١٩٨٤)

**١٩٠٤**: ڕووناکبیری کورد، د. عەبدوللا جەودەت ١٨٦٩- ١٩٣٢ چاپخانەی (ئیجتیهاد) دادەمەزرێنێ. کاتێ لە دوورەوڵاتدا ژیاوە لە ژنێف، لە ڕۆژی ١٩٠٤/٨/٤ یەکەم ژمارەی گۆڤاری اجتهاد بەو چاپخانەیەی خۆی بڵاودەکاتەوە، پرۆژەی بڵاوکردنەوەی زنجیرە کتێبێکیش دەگرێتە ئەستۆ، بە زمانی تورکیی عوسمانلی و فەرەنسی، کە تا ڕۆژی مردنیشی هەر مابوو. چەندین گۆڤار و بڵاوکراوە و ڕۆژنامە و کتێب بۆ کورد و تورک، هەر بەم چاپخانەیە بڵاودەکاتەوە.
- سەعید صدقی حەسەن کابان مامۆستای قوتابخانەی مەحموودیە بووە.
- دیوانی مەلای جەزیری، لە بەرلین لەلایەن کوردناسێکەوە چاپ دەکرێ.
- لەدایکبوونی گۆران (١٩٠٤- ١٩٦٢)

**١٩٠٧**: کۆنگرەی ئیتیحادییەکان (تورکە لاوەکان) لە پاریس: بەڵێنی خودموختاری دەدەنە کورد.
- لە ماوەی ١٩٠٧- ١٩١٢: ڕاپەڕینی شێخ عەبدولسلامی بارزانی.

**١٩٠٧**: باوکی شەریف پاشا، سەعید پاشای خەندان، دەکرێتە سەرۆکی شوورای دەوڵەتی عوسمانی. لەکاتێکدا پلەی شەریف پاشاش دەگاتە پلەی فەریقی یەکەم.



**کوردێکی موکری، تابلۆیەکی کوردستانی ئێران سەرەتای سەدەی بیستەم**

## ١٩٠٥

– یەکەم شانۆگەری لە کوردستانی عیراقدا، لە هەولێر، بە ناونیشانی (میری دیل).

– ئۆسکارمان: توحفەی مظفریە، ٢٠٢ لاپەرەیە. کۆمەڵێک چیرۆک و بەیتی کوردین، بە شیعر، زۆریشیان بە پەخشان، لە ١٩٠٣-١٩٠٤ بە دیالێکتی موکری، بۆ ئۆسکارمانی ئەڵمانی تۆمارکراون. لەلایەن هێمنی موکریانییەوە هەڵگێردراوەتە سەر رێنووسی ئەمڕۆی کوردی.

– لەدایکبوونی عوسمان سەبری (١٩٠٥- ١٩٩٣)

– لەدایکبوونی بێکەس (١٩٠٥ ـ ١٩٤٨)



وێنەی سەرەوە: سمکۆ
وێنەی خوارەوە: کوردستانی تورکیا



## ١٩٠٦

– ساڵح زەکی ساحێبقڕان (١٨٩٤: هەڵەبجە) لە ١٨٩٤ چۆتە روشدیەی سلێمانی. لە ١٩٠٣چوە بۆ ئەستەمبۆڵ لە مەدرەسەی حەربیە تەوای کردووە لە ١٩٠٦ هاتۆتەوە سلێمانێ. لە حکومەتی شێخ مەحموود کرا بە وەزیری جەنگ. لە ١٩٢٥ گوڤاری دیاری کردستانی بە تورکی و عەرەبی ، کوردی بڵاوکردەوە. تەرجەمەی زۆر تیایە. لە ١٩٣٥ کرا بە متصرفی سلێمانی.

– لەدایکبوونی رەشید نەجیب (١٩٠٦- ١٩٦٨)

## ١٩٠٨

– کورد تەعاون جەمعیەتی، ئامانجی: دامەزراندنی دەوڵەتی کورد بوو. سەرۆک: سید عبدالقادر سید عبدالله شەمزینی، جێگر: ئەمین عالی بەدرخان و فەریق فوئاد پاشا. نووسەری گشتی: فەریق ئەحمەد پاشا. ئەندامان: محەمەد شوکری سەگبان، محەمەد عەلی بەدرخان، شوکری بابانزادە، شەفیق ئارواسلی، فوئاد بابانزادە، فتح الله ئەفەندی، محەمەد ئەمین بێگ سلێمانیەلی.

– کۆمەڵەی نەشری مەعاریفی کوردی لە ئەستەمبۆڵ دادەمەزرێت و خوێندنگەیەک بۆ منداڵانی کورد لە ناوچەی (چەنبەرلی تاش) دروست دەکا.

– خەلیلی خەیاڵی، لەگەڵ هەندێ هاوڕێی ڕووناکبیری دیکەی، لە گەڕەکی گیوو بەگ پاشا لە ئەستەمبۆڵ کۆمەڵێکیان دامەزراند بە ناوی «جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی» پاشان چاپخانەیەکیشیان بۆ بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەکەیان دامەزراند کە کۆمەڵێک کتێبی ڕێزمانی و قوتابخانەییان پێ چاپ کرد.

– ڕۆژنامەی کورد لە ئەستەمبۆڵ. پیرەمێرد سەرنوسەرە.

– لەدایکبوونی بەختیار زێوەر (١٩٠٨– ١٩٥٢)

## ١٩٠٩

– کورد نەشری مەعاریف جەمعیەتی لە ئەستەمبۆل دامەزرا، کتێبی قوتابخانەیی و ڕێزمانی کوردییان چاپ دەکرد و قوتابخانەیەکی کوردییان بە ناوی (کورد نموونە مەکتەب ئیپتیدائیسی – مەشرووتیەت) لە ساڵی ١٩٠٩–١٩١٠ لە ئەستەمبۆڵ دامەزراند. خەلیل خەیالی بەڕێوەبەر، ئەحمەد کوردیزادە و سەعید نەورەسی مامۆستای ئەو قوتابخانەیە بوونە.

– یانەی بتلیس داخرا

**١٩٠٨**: کوودەتای کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی (تورکە لاوەکان) بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا. مانگی ١٩٠٨/١٢: حکوومەتی ئیتحادییەکان، ڕێکخراوە کوردییەکەی (کورد تعاون و ترقی جمعیەتی) دادەخات، دکتاتۆرییەتێکی سەختیش دەچەسپێنێتە سەر ئازادی و مافەکانی گەلی کورد. ژەنەراڵ شەریف پاشا، کە تا ئەم ساڵەش خۆی بە ئەندامێکی ئیتحادییەکان دەزانی، سەبارەت بەم هەڵوێستە تۆرانچێتییە دەرهەق بەکورد، لێیان هەڵدەگەڕێتەوەو دژیان دەوەستێ.

– نەخشەی کوردستانی گەورە لەلایەن (مارک سایکس) دروست دەکرێ.

## ١٩٠٨/٩/١٩

– ڕێکخراوی «کوردستان تەعالی و عەزمی قەوی جەمعیەتی» شەریف پاشا و عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان لە ئەستەمبۆل دایانمەزراند. هەندێ مێژوونووس وای بۆ دەچن کە ناوی (کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی) بووە. ڕۆژنامەیەکیان لە ١٩٠٨ بلاودەکردەوە بە ناوی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی)؛ پیرەمێرد سەرۆک نووسینی بوو؛ سەعید نەورەسی و عەبدوڵا جەودەت و ئیسماعیل حەقی بابان و چەندین نووسەری دیکە لەو گۆڤارەدا دەیاننووسی. لە ٢٥ی ئەیلوولی هەمان ساڵ یانەیەکی ڕۆشنبیریی کوردیی کردەوە.

– ١٩٠٨/٩/٢٥: شەریف پاشا، لە ئەستەمبۆڵ، لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و داماو ئەحمەد و زولکەفەل پاشا... کۆمەڵەی (کورد تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی) دادەمەزرێنن. لە هەمان ڕۆژدا یانەی کۆمەڵەکەش لەئەستەمبۆڵ دەکرێتەوە و نوێنەری شاری مووش، ڕەشید بەگ، وتاری کردنەوەی یانەکەی تێدا دەخوێنێتەوە.

**١٩١٠**

– قوتابخانەیەکی دیکە لە ئەستەمبوڵ لە گەڕەکی دیوانلی دادەمەزرێ، عبدالرحمن بدرخان مامۆستا بووە و مانگی ٣٠ لیرەی عوسمانلی لە باخەڵی خۆی لە خەرجیی ئەو قوتابخانەیە سەرف کردووە.

– یەکەم دەستگای سینەما، کە بە پیل ئیشی دەکرد، هاتە سلێمانی؛ لە خانی شێخ ئەحمەد دامەزرا. خەڵک بە شەو دەچوونە سەیرکردنی.

**١٩١١– ١٩٧٢** : قەدربجان
**١٩١١– ١٩٤٦**: وەزیری نادری
**١٩١١ ـ ١٩٨٨**: ئەخۆڵ

**١٩١٢– ١٩١٣** : میقداد– مەدحەت دەکەن بە موتەصەریفی (پارێزگاری) شاری دەرسیم.

**١٩١٢**: یەکەمین ڕێکخراوی خوێندکارانە بە ناوی (هێڤی – جەمعیەی تەڵەبەی کوردان) کە پێشتر لە ١٩١٠/١/١٠ دامەزرابوو، بەڵام لە ١٩١٢ مۆڵەت وەردەگرێت. محەمەد شوکری سەگبان پێویستییە داراییەکانی مەیسەر دەکرد. عومەر جەمیل پاشا سکرتێری هێڤی بوو. لقی یەکەمی لە ئەرزەڕۆم لەلایەن تەیب عەلییەوە کرایەوە (لە شۆڕشی شێخ سەعید بەشداری دەکا و دەبێتە خۆبەخت). لە ١٩١٣ گۆڤاری ڕۆژی کورد لە ئەستەمبوڵ دەردەکەن. بەشە تورکییەکەی، د. عبدالله جەودەت و اسماعیل حەقی بابان و مەمدووح سەلیم وانلی بەڕێوەیان دەبرد. کوردییەکەش: نجم الدین حسین کرکوکلی و عبدالکریم سلێمانیەلی.

**١٩٠٩/١**: میانە و پێوەندیی نێوان ژەنەڕاڵ شەریف پاشا و سەرکردایەتیی حکوومەتی ئیتحاد و تەرەقی، بەتەواوەتی تێکدەچێ: لەسەر ئەوەی کە ئیتحادییەکان ڕازی نابن شەریف پاشا ببێتە باڵوێزی دەوڵەتی تورکیا لە پاریس.

**١٩٠٩/٢**: شەریف پاشا دەگاتە پاریس خۆی و خێزان و دوو کچەکەی. لە ناوەڕاستی ١٩٠٩ حزبێک بە ناوی حزبی ڕادیکاڵی عوسمانی دژ بە حکوومەتی ئیتحادییەکانی تورکیا، لە شاری پاریس دادەمەزرێنێ.

**١٩٠٩/١٠/١٥**: ژەنەڕاڵ شەریف پاش گۆڤارێک بە ناوی مەشرووتیەت کە ئۆرگانی حزبەکەی خۆیەتی، لە پاریس بڵاو دەکاتەوە کە تا مانگی شوباتی (١٩١٤) بەردەوام دەبێت و (٥٥) ژمارەی لێ بە زمانی فەڕەنسی بڵاو دەکاتەوە.

**١٩١٠– ١٩١٤** : ژەنەڕاڵ شەریف پاشا پێوەندییەکی بەردەوام و پتەوی، لەپاریسەوە، هەبووە لەگەڵ (جەمعیەت) و (کڵووب) و (شەخسیات) و ڕێکخراوە نهێنییەکانی کوردستان، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەوانی ئەستەمبوڵ و قاهیرە و ژنێف. (مەسەلەی کورد) لەڕێگای گۆڤارەکەی شەریف پاشاوە دەگاتە ئاستی گفتوگۆی دیبلۆماسی و نێو دەوڵەتی.

**١٩١٢**: شێخ عەبدالسلام بارزانی لەسێدارە درا بەدەستی تورکەکان

**١٩١٢-١٩١٤**

کۆمەڵەی ئیستیخلاسی کوردستان لە ورمێ لە ساڵی ١٩١٢، لەلایەن سەید عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عبیداللەی نەهری، بە هاوکاریی سەید تەهای نەهری و سمکۆ ئاغای شکاک دامەزراوە.

## ١٩١٣

- یەکەمین گۆڤاری کوردی کە بۆ یەکەم جار وێنەی فۆتۆگرافیی بڵاو کردبێتەوە بریتیە لە (رۆژی کورد) لە ئەستەمبوڵ، لە ژمارە (٣) لە (١٩١٣/٨/١)، فۆتۆگرافێکی (حوسێن کەنعان پاشای بەدرخانییەکانی) لە بەرگی پێشەوەدا بڵاو کردۆتەوە.
- یەکەمین وێنەگری کورد لە کوردستاندا ستۆدیۆی وێنەگرتنی دامەزراندبێت و هونەری فۆتۆ و وێنەگرتنی لەناو کورداندا بڵاو کردبێتەوە و وێنەگرتنی کردبێتە پیشەیەک بۆ خۆی محەممەد یووسف سدیق غەزنەوی یە ١٨٩٤-١٩٦٤. خەڵکی شاری ئاکرێ بووە ستۆدیۆیەکی وێنەگرتنی لەوێ کردۆتەوە.




- لە ١٩١٣/١/٤ یان لە ٢٢ی تشرینی یەکەمدا عبدالرزاق بەدرخان لە شاری (خوی) لە کوردستانی ئێران کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردستان) یان (کۆمەڵەی جیهاندانی) دادەمەزرێنێ لەگەڵ قوتابخانەیەکی کوردی کە تێیدا ئەلف و بێی ڕووسی و ئەدەبی ڕووسی و زمانی کوردی فێری قوتابیان دەکەن. سمکۆ ئاغای شکاک هاوکاریی دەکردن.
- لە ژمارە ١و٢ی گۆڤاری رۆژی کورد لە ئەستەمبوڵ، زاراوەیەکی ئەدەبیی تازە کە واتای ژانرێکی ئەدەبیی نوێ دەگەیەنێ سەری هەڵدا: چیرۆک. بە پێنووسی فوئادی تەمۆ نووسراوە.
- ئەوڕەحمان بەگی نفووس: نووسینی یەکەمین شیعرەکانی خۆی بە نازناوی حەزمی.
- لە ١٣-١٩١٥ دوو جار سینەمای سەفەری لەلایەن تیپی عوسمانییەکانەوە لە رێگەی زاخۆوە هاتۆتە هەولێر، لەسەر گالیسکەیەک دانرابوو و فلیمی سوڵتان عەبدولحەمیدی پیشانداوە، پاشان چۆتە کۆیە و سلێمانی.

- لەدایکبوونی ئەنوەر مائی ( ١٩١٣ ـ ١٩٨؟)

**١٩١٤- ١٩١٨: جەنگی یەکەمی جیهانی**
کاریگەرییەکی گەورە دەنوێنی بەسەر داهاتووی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی لەم ماوەیەی گواستنەوەدا.

- لە ١٩١٤ مەلا محمد خواهەرزاد بۆ یەکەم جار بیست بەرگ تەفسیری قورئان دەکاتە کوردی و نێوی لێ دەنێ (تەزکاری ئیمان بۆ کۆمەڵی کوردان).
- لە ١٩١٤ بەملاوە ژمارەی قوتابیانی ناوەندی لە سلێمانی: ١٦٣ کەس بووە.
- زۆربەی قوتابیانی کوردی هەولێری، بۆ نموونە، دەرچووانی قوتابخانەی روشدیە یا مەدارس، دەچوونە (دارالمعلمین ابتیدائی سی) و (حقووق کولیەسی) لە مووسل. لە سلێمانی و شارە گەورەکانی دیکەی کوردستانیش، بە هەمان شێوە: بۆ فێربوون و خوێندن ڕوویان دەکردە بەغدا و ئەستەمبۆڵ. هەروەها، دووای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، یەکەمین قوتابخانەکان بۆ کوڕان لە کوردستاندا کرانەوە. دووا بەدووای ئەو، قوتابخانە بۆ کچانیش، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا دەرگاکانیان کەوتە سەر پشت.
- گۆڤاری هەتاوی کورد (ئەستەمبۆڵ /١٩١٤).

**١٩١٥:** حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٨٣-١٩٤٧) چاپخانەیەکی لە ئەڵمانیاوە هێنایە حەلەب، پاشان لە ١٩٢٥ گواستییەوە بۆ رواندز و ئنجا لە ١٩٤٨ هێنای بۆ هەولێر. گۆڤارەکانی رۆناکی و زاری کرمانجی (١٩٢٦- ١٩٣٢) و دەنگی گێتی تازە و سەدان کتێب بەو چاپخانەیە کراون.

- قەسری عەتاولاغا (عەتاولاغای کوڕی حاجی رەشید ئاغا-١٨٨٢- ١٩٦٣ کە دژی بریتانیا بووە) لە ١٩١٥ وەستا بەکری کوڕی وەستا مستۆ دروستی کرد. دوازدە دەرگای نەخشینی هەبوو. چوار ردەوری هەمووی رەز و باخ بوو
- لە هەولێر، سەید غەریب بەرزنجی چاپخانەی «سەید غەریب»ی دروستکرد و بووە بارەگای نووسەر و هونەرمەندان؛ قەوانێکی تێدابوو گۆرانییەکانی مریەم

**١٩١٣**
- ڕاپەڕینی سمکۆ ئاغای شکاک لە کوردستانی ئێراندا.
- ژەنەرال شەریف پاشا لە ژمارە (٤٧)ی گۆڤارەکەی خۆیدا نامەیەکی پیرۆزبایی بەزمانی فەرەنسی بەبۆنەی دامەزراندنی (جەمعیەتی هیوای طەلەبەی کوردان) بلاو دەکاتەوە و داوا لە گەلی کورد دەکات کە خەبات پتەوتر بکەن بۆ ئەوەی «لەدەست ئەو بەلایەی ولاتەکەمان رزگارمان بێت کە ناوی ئیتیحادو تەرەقییە». لەهەمان وتاردا پیرۆزبایی لەدەرچوونی گۆڤاری (رۆژی کورد) دەکات.

**١٩١٤- ١٩١٨: جەنگی یەکەمی جیهانی**

سەرەتای ١٩١٤: شەریف پاشا لە حکوومەتی ئینگلیزەکان نزیک دەکەوێتەوە بۆ چارەکردنی کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا. لەگەڵ بیرس کۆکس، باڵوێزی بەریتانیا لە پاریس، کۆدەبێتەوە. ئامادەیی خۆی نیشان دەدات بۆ هاوکاریکردنی حکوومەتی بەریتانیا لەبارەی نەخشەدانانێک بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا.

٢٩ی تشرینی یەکەمی **١٩١٤:** کۆچی دووایی سەعید پاشای خەندان، نائیبی مەجلیسی عالی (جیگری سەرۆک پەرلەمان) لە دەوڵەتی عوسمانیدا کە دەکاتە باوکی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا.

**١٩١٥** : لوتفی فیکری، لەگەڵ چەند روشنبیرێکی دیکەی کورد پارتی موجەددید لە ئەستەمبۆڵ دادەمەزرێنێ.: جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و دابڕانی خەلافەت لە سوڵتان.






*Shaikh Mahmud with gunners*

خان و سێوەی لێدەدا. مەلا عەلی کلاشدروو شەوان هەقایەتی کوردەواریی تێدا دەگێڕایەوە.

**١٩١٦:** لە چارەگی یەکەمی سالانی (١٩٠٠) لە هەولێر، بەپێی سجلاتی کۆنی پەروەردەی هەولێر، وانەی " لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و ئال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت " دەخوێنرا. کەواتە، وانەی رەسم و هونەرە دەستییەکان بەشێک بووە لە پێداویستییەکانی خوێندن و پەروەردە.

**١٩١٧ – ١٩١٨:** ڕۆژنامەی کوردستان، خولی سێیەم ،لەلایەن ثریا بەدرخانەوە (١٨٨٣–١٩٣٨)، لە ئەستەمبۆڵ بڵاوکراوەتەوە.

**١٩١٨:** لە ١ /١ /١٩١٨ ڕۆژنامەی تێگەیشتنی راستی لە بەغدا، کە لە ژمارە ٢٣ و ٢٤دا بابەخێکی تایبەت دەداتە بیری نوێخوازی لە شیعرنووسیندا؛ بۆ یەکەم جار وشەی «نوێخوازی – تجدد» بەکاردەهێنێت.

– ئەحمەدی خانی: عەقیدا ئیمانێ، ئەستەمبۆڵ.

– لقێکی جەمعیەتی تەعاون لە دیاربەکر کرایەوە و ناوی نرا یانەی کورد (کورد کلۆبی). دکتۆر جەوودەت بەگ جێگری سەرۆک بوو، کەریم جەردیس زادە ژمێریار. نزیکەی دوو هەزار ئەندامی هەبوو لەوانە محەمەد میهری و دکتۆر فوئاد. لە کۆتاییدا ڕێکخراوێکی دیکەی لێ دامەزرا بە ناوی تەشکیلاتی ئیجتیماعیە؛ ئەمین عالی بەدرخان و شوکری بابانزادە و عەبدوللا جەوودەت و ئەکرەم جەمیل پاشا سەر بەم ڕێکخراوە بوون. گۆڤاری ژین ١٩١٩ ئۆرگانیان بوو.

– قوتابخانەی سلذانیە لە کەرکووک هەبووە.

– کۆچی دوایی (سەید ئەحمەد فائیزی بەرزنجەیی) لە ئەستەمبۆڵ، خاوەن کتێبی (کنز اللسان) کە بریتیە لە یازدە ستوون و بە شەش زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی و فەرەنسی و ڕووسی و کوردس نووسراوە: بە

**١٩١٦:** ڕێککەوتنامەی (سایکس پیکۆ): دابەشکردنی کوردستان بەسەر بریتانیا و فەرەنسا و ڕووسیا

**١٩١٧:** کۆنفرانسێک لە سنە دەبەسترێ: ڕووسیا بەڵێن دەدات یارمەتیی کوردەکانی ئێران بدات بۆ وەدەستهێنانی مافەکانیان.

– لەشکری ئینگلیز خانەقین داگیر دەکەن .

**١٩١٨–١٩٢٣**

شۆڕشی شێخ مەحموود لە کوردستانی عێراقدا

**١٩١٨**

– کۆمەڵەی (کوردستان تەعالی جەمعیەتی) لە ئەستەمبۆڵ، کە شێخ عبدالقادری شەمزینی سەرۆک و ئەمین عالی بەدرخان جێگر بووە. ئەندامەکانیشیان: حیکمەت بابان، مستەفا شەوقی، محەمەد میهری، هەمزە موکسی، مەمدووح سەلیم، ع. ڕەحمی هەکاری، عەزیز یامولکی، کەمال فەوزی.

– کۆمەڵەی (کوردستان ئیستیقلال جەمعیەتی) لە قاهیرە لەلایەن سورەییا بەدرخان دامەزراووە.

– جەنگ کۆتایی دێ: لەشکری ئینگلیز کەرکووک و پاشان مووسڵ داگیر دەکەن. مێجەر نۆئێل دەچێتە سلێمانی، شێخ مەحموود دەکەنە (حوکمداری کوردستانی عیراق). لەم ساڵەدا ژمارەی دانیشتووانی سلێمانی (١٣٢٩) کەس بووە.

– کۆلۆنێل لیچمان کرایە فەرمانداری ویلایەتی مووسڵ کە هەولێر و دهۆکیشی دەگرتەوە.

– عەبدالرزاق بەدرخان لە مووسڵ ئیعدام دەکرێ، سمکۆ ئاغای شکاک لە کوردستانی ئێران ناوچەکانی ورمێ لە لەشکری ئیران پاک دەکاتەوە و شەڕ لەگەڵ لەشکری ئێران دەکا لەپێناو سەربەخۆیی نەتەوەیی.

– یانەی کوردی لە دیاربەکر لەلایەن ئەکرەم جەمیل پاشاوە

پازدە جۆر دەخوێنرێتەوە: لە سەرەوە بۆ خوارە و لە چەپەوە بۆ ڕاست و هەموشیان بەپێچەوانەشەوە.
– گرووپی شاعیرانی گۆڤاری ژین (ئەستەمبۆڵ ١٩١٨- ١٩١٩) کە پشتیان بەستبوو بە ئایدیۆلۆژیەت و سیستەمێکی تازەی بیرکردنەوە: «ئایدیۆلۆژیەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیە کۆنەکان، ئەمڕۆ، روو لە هەرەسن. ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لە سازکردنی چەند رچە و پرینسیپێکی تازە دەکەین».
– لەدایکبوونی دڵدار (١٩١٨ ـ ١٩٤٨)

## ١٩١٩

– بڵاوبوونەوەی یەکەم شانۆنامە بە زمانی کوردی (مەمێ ئالان) بە پێنووسی عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری: گۆڤاری ژین، ژ ١٥ و ١٦، لە ئەستەمبۆڵ، ساڵی ١٩١٩.هەروەها بڵاوکردنەوەی یەکەمین دیوانە شیعری شاعیرێک کە خۆی لە ژیاندا بێت بە ناونیشانی(گازیا وەلات) لە ئەستەمبۆڵ.
– لە مانگی گوڵان، لە ئەستەمبۆڵ بۆ یەکەم جار (کۆمەڵەی پێشکەوتنی ژنانی کورد/ کورد قادینلار تعالی جمعیەتی ) دادەمەزرێت لە پێناو گرێدانەوەی خەباتی ئافرەتانی کورد بە خەباتی نەتەوەییەوە.
– دەرکەوتنی رەسم و تەختیتەکانی یەکەم نیگارکێشی سلێمانی، حەسەن فەلاح: تابلۆی (شەڕی دەربەندی بازیان) دروست دەکات.
– سەعید نورەسی و هەمزە و خەلیل خەیالی لە دامەزرێنەرانی (کورد تەعالی جەمعیەتی) بوون لە ئەستەمبۆڵ ساڵی ١٩١٩.
– وەرگێڕانی (ئینجیل) لە چوار بەرگدا بۆ کوردیی مهابادی، لە یۆنانییەوە، لەلایەن: ئەمێریکان بایبل سۆسایەتی.
– کورد تەئمینی مەعاریف و نەشریات جەمعیەتی لە ئەستەمبۆڵ.
– لە سەردەمی شێخ مەحموددا رەشید زەکی کابان (١٨٦٧ ـ ١٩٤٠ ) کە خۆی دەرچووی روشدیەی

## ١٩١٩

– داخوازینامە نێودەوڵەتیەکەی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی.
– یەکەم جار کوردێک، ژەنەڕاڵ شەریف پاشا نەخشەیەکی کوردستانی گەورە دروست دەکات و وەک ئامرازێکی دەربرینی هەستی نەتەوەیی، لەناو داخوازینامەکەیدا بە ئەرکی دەخات.
– ڕاپەڕینی سمکۆ ئاغای شکاک
– لەکاتێکدا هەموو کوردستانی عیراق لەژێر دەستی ئینگلیزدایە، ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود دژی ئینگلیز لە سلێمانی و دەوروبەری دەست پێدەکات، کە (مەحموودخانی دزلی) لە کوردستانی ئێرانەوە هاوکارییان دەکا کە لە ١٩٢٠ ئێران دەیگرێت و بەو تۆمەتە دووری دەخاتەوە بەرەو هیندستان. لە ١٩١٩/٥/٢ ئینگلیزیان لە سلێمانی دەرکرد
– بەستنی پەیمانی (سنت ریمۆ) لەنێوان فەرەنسا و بریتانیا: کوردستانی باشوور دەلکێندرێتە دەوڵەتی عیراق. مێجەرسۆن کرایە حاکمی سلێمانی. نەوتی کوردستان دابەش کرابووەسەر بریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا.
– سەرنووسەری ڕۆژنامەی ژین، هەمزە بەگ، لە ئەستەمبۆڵ، لەسێدارە دەدرێ.

– لە ١٩١٩/٦/١٩ شێخ مەحموود لە شەڕی دەربەندی بازیان بەدیل دەگیرێت.
– بۆ یەکەمجار ئینگلیز ئۆتۆمبیلیان هێنایە سلێمانی

سلێمانی بووە، بۆتە مودیری قوتابخانەی مەحموودیە.

– زۆربەی قوتابیانی کوردی هەولێریی دەرچووانی قوتابخانەی روشدیە یا مەدارس دەچوونە دارالمعلمین ابتیدائیسی لە مووسڵ و حقووق کولیەسی لە مووسل.

– لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری «کوردستان» لە ئەستەمبوڵ بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، پارچە شیعرێک بە ناونیشانی (دەلالیا زارۆکان) بۆ منالان، بە قەڵەمی «زینۆ» ناوێک (ئەمین عالی بەدرخان؟) لە ژمارە(٦)دا بلاوکراوەتەوە.

## ١٩٢٠

– مێجەرسۆن یەکەم چاپخانە بۆ کوردستانی عیراق دەهێنێتە سلێمانی و لەوێ ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە ٢٩/٤/١٩٢٠ دەردەکا تا ٢٧/٧/١٩٢٢ بەردەوام دەبێ. لەسەر لاپەڕەکانیدا (٥٠) شیعر بلاودەکاتەوە و بۆ یەکەم جار کۆمەڵێک چیرۆکی وەرگێڕدراو لە ئینگلیزییەوە بلاودەکاتەوە لەگەڵ چەندین چیرۆکی خۆماڵی. هەروەها پێشبڕکێیەک دادەنێ بۆ ئەو نووسەرانەی کە بە پاکترین و پەتی ترین کوردی دەنووسن؛ سێ خەلاتیشی دانابوو.

– لە ٢٠/٥/١٩٢٠ یانەی سەرکەوتن لە بەغدا.

– یەکەم کتێبی چاپکراوەی رەسمی لە کوردستانی عیراقدا کە بۆ قوتابخانەکان ئامادەکرا و بلاوکرایەوە، نووسراوی مامۆستای قوتابخانەی نموونەی سەعادەت، محەمەد باشقە (١٨٩٠ ـ ١٩٨٠) کە بە هاوکاریی مێجەرسۆن و محەمەد زەکی دایناوە بە ناونیشانی (ئەوەڵەمین قیرائەتی کوردی) لە ساڵی ١٩٢٠دا لە چاپخانەی حکوومەت لە بەغدا چاپکراوە. ئنجا لە ١٩٢٦ لەلایەن ئەحمەد عەزیز ئاغاوە ( ئەلف و بێ ) لەجیاتی (ئەوەڵەمین قیرائەت) بۆ پۆلی یەکەم دانرا.

– دامەزراندنی" لیژنەی فەن و تەمسیل" لە قوتابخانەی ئەربیل ئوولای هەولێر کە یەکەم لیژنەی نواندنی شانۆیی پێک هێنا لە کوردستاندا.

– لە ١٧ی مانگی ئۆگەستی ١٩٢٠، لە سلێمانی

## ١٩٢٠

– لە ١٧/٦/١٩٢٠ حکوومەتێکی عەرەبی بەناوی عیراق ڕاگەیەندرا. عبدالرحمن گەیلانی دەبێتە یەکەمین سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی عیراق.

– مەلا فەندی لە هەولێر پشتیوانی ئینگلیزەکان بوو.

– سمکۆئاغای شکاک بەشێکی کوردستانی ئێرانی ئازاد کردووە، ڕۆژنامەیەک دەردەکا (کورد) لە ورمێ.

– لە ١٠/٨/١٩٢٠: ئیمزا کردنی پەیمانی سیڤەر لەنێوان تورکیاو دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا کە لەسەر بنچینەی داخوازییەکانی ژەنەڕاڵ شەریف پاشا هەڵچنرابوو. لە بەندی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤)ی پەیمانەکەدا، بەڵێنی سەربەخۆیی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی درابوو. تورکیاش بۆ دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە رەزامەندیی پیشان دابوو.

## ١٩٢١

– تورکیا و هاوپەیمانەکان، بەپێی پەیمانی سیڤەر، کە دابوویانە کورد بۆ ئەوەی دەوڵەتیان بۆ دروست بکەن، لە گفتوگۆدان. ونستۆن چەرچل بیر لەوە دەکاتەوە کە دەوڵەتێک بۆ کورد دابمەزرێنێت.

– لە ٧ /٣/ ١٩٢١: شێخ مەحمود نەفی کرا بۆ هیندستان.

– ڕەزا شا دەبێتە شای ئێران و هێزی سەربازیی خۆی پتەوتردەکا بۆ لەناوبردنی بزاڤی نەتەوەیی کورد، سمکۆ شاری مهاباد دەگرێ.

– لە ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢١: ڕێکەوتنی فەرەنسا و تورکیا لەسەر ئەوەی کە مەڵبەندەکانی (جەزیرە) و (کورداغی) لەلایەن تورکیاوە بدرێتە پاڵ سوریای ژێر ئینتدابی فەرەنسا. ڕاپەڕینەکانی دەرسیم دەست پێدەکەن.

– ٢٢ی ئابی ١٩٢١: بریتانیا ئەمیر فەیسەڵی کردە مەلیکی عیراق.

– پێشەوا قازی محمد هاوکاریی ڕاپەڕینەکانی سمکۆ دەکا.

– لە ٦ /١٢/ ١٩٢١چەند ئەفسەرێکی کورد بەشدارییان لە دامەزراندنی سوپای عیراقدا کرد.

«لە مەکتەبی نموونەی سەعادەت قوتابی قەید و قبووڵ دەکرێ و لە یەکی مانگی سێپتەمبەری ١٩٢٠ ڕۆژی چوار شەممە مەکتەب دەکرێتەوە و دست بە دەرس خوێندن دەکرێ. حکوومەت کتێب، دەفتەر، قەڵەم، کاغەز، مەرەکەب، تەباشیریان ئەداتێ».
- زیوەر: قصص الانبیا (چیرۆکی ژیانی پێغەمبەران)، سلێمانی.
- لەدایکبوونی هەژار (١٩٢٠ - ١٩٩١)

## ١٩٢١

- بڵاوکراوەیەکی (٦٥) لاپەڕەیی جەمعیەتی تەڵەبەی کوردان (هێڤی) بۆ فێرکردنی زمانی کوردی: هینکەری زمانی کوردی، ئەستەمبۆڵ.
- ئەمین فەیزی: ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد، کە یەکەمین تۆژینەوەی چاپکراوە لەبارەی شیعر و شاعیری؛ لە ئەستەمبۆڵ چاپ دەکرێ (لە ١٨٩٦ نوسیبووی).
- گۆران، تەمەنی (١٦) ساڵە، لە ژمارە ٦١ی پێشکەوتن، یەکەمین نوسینی خۆی: ئەسەفی ماضی و ئەندێشەی ئیستیقبالم.. بڵاودەکاتەوە.
- دەرکەوتنی یەکەمین شیعرەکانی بێکەس و ئەسیری و کەماڵی (عەلی باپیر ئاغا) .
- ئەحمەد خواجە دەڵێ: " کۆمەڵەی لاوانی کورد " کە لە هەولێر لە ١٩٢١ دامەزرابوو، لە هەولێر شانۆگەریی سەلاحەدینیان پێشکەش کردووە. عبدالله عزیز کارگەچی و احمد فەخری سامی و عبدالله سامی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بوون و بەشدارییان لەو شانۆگەرییەدا کردووە. بڵاوکراوەیەکی دەسنووسی رەخنەیی توندوتیژیان هەبوو.
- لەدایکبوونی هێمن (١٩٢١ - ١٩٨٦)
- لە (٢١ - ١٩٢٢) عەزیز سەلیم لە کەلار، بە خەڵووز لەسەر دیواری ماڵ و مزگەوتەکاندا رەسمی کردووە.

**١٩٢٢** : لەکاتێکدا شۆڕشی شێخ مەحموود لە کوردستانی عیراقدا دژی ئینگلیز هەڵگیرساوە و لایەنگیریی تورکیای پێ خۆشە، لە کوردستانی تورکیاشدا نوێنەرەکانی شۆڕشی کورد لە تورکیا- ئەوانیش رادەگەیەنن کە «نایانەوێ کوردستان لە تورکیا جودا ببێتەوە». نوێنەرە کوردەکانی هەموو شارەکانی بەتلیس و وان و دیاربەکرو مەلاتیان و دەرسیم و ئورفە.. ئەمەیان راگەیاند.
- سمکۆ رایدەگەیەنێ کە «شای کوردستانی ئێرانە»
- شێخ مەحموودی نەفیکراو لە هیندستانەوە دەهێننەوە بەغدا و پاشان بۆ سلێمانی کە لە ١٩٢٢/٩/١٤ دەبێتەوە «پاشای کوردستان».
- ١٠/١٠/١٩٢٢ یەکەمین وەزارەتی حکوومەتەکەی شێخ مەحموود لە سلێمانی و دەوروبەری، کە دژی پەرلەمانی بەغدا بوون
- لە ١٩٢٢/١٢/١٦ مستەفا کەمال ئەتاتورکی کوردکوژ دێتە سەر حوکم
- مستەفا پاشا یامولکی ( ١٨٦٨ ـ ١٩٣٦) میر لیوا لە سوپای عوسمانیدا، سەرۆکی جەمعیەتی کوردستان ١٩٢٢، وەزیری معاریف لە حکوومەتەکەی شێخ مەحموددا ١٩٢٢، خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەری رۆژنامەی بانگی کوردستان. باوەڕی بە پان ئیسلامیزم هەبوو ( ب. ک. ژ ١٢)، بۆیە دوژمنایەتیی کەمال ئەتاتورک و جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقیی دەکرد و دەمڕاستی لایەنگرانی ئینکلیز بووە دژی تورک.
- کۆمەڵەی کوردستان لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٢٢ کە مستەفا عەزیز پاشا و ڕەفیق حیلمی و ساڵح قەفتان و ئەحمەدبەگ و شوکری عەلەکە دایانمەزراندووە و گۆڤارێکیان بە ناوی (بانگی کوردستان) دەرکردووە. ئامانجی سەرەکییان بریتی بووە لە پشتیوانیکردنی شۆڕشی شێخ مەحموود.

**١٩٢٢**: شانۆگەریی (قەرالّیچە)، کۆمەڵە گەنجێک لە شاری هەولێر پێشکەشیان کردووە.
– – لە بیستەکاندا لە گەڕەکێکی شاری هەڵەبجە جێگای تایبەتی بۆ پیشاندانی شانۆگەری هەبووە.
– بانگی کوردستان ( ڕ. سلێمانی ١٩٢٢ و ١٩٢٦).
– ڕۆژی کوردستان ( ڕ. سلێمانی ١٩٢٢ـ ١٩٢٣).

## ١٩٢٣

– یەکەم شانۆگەری لە سلێمانی، شانۆگەریی (عیلم و جەهل) لە ئامادەکردنی فوئاد ڕەشید بەکر، کۆمەڵە لاوێک پیشانیان داوە.
– لە سلێمانی، پێش ئەوەی هێشتا هیچ تیپێکی شانۆیی دامەزرێت، شانۆگەریی دایک، نوسینی شێخ نووری شێخ ساڵح، قوتابیانی قوتابخانەی کچانی سلێمانی، لە سلێمانی پێشکەشیان کردووە.
– تیپێکی شانۆیی میسری، بە سەرپەرشتیی بشارە واکیم ، لە سلێمانی و شارەکانی دیکەی کوردستاندا نواندنی پێشکەش کردووە.
– بانگی حەق ( ڕ. سلێمانی ١٩٢٣).
– ئومێدی ئیستیقلال ( ڕ. سلێمانی ١٩٢٣).

## ١٩٢٤-٢٣

– ڕووناکبیر و نووسەرانی کوردی ئەستەمبۆڵ لە ١٩٢٣ بەملاوە، واتە دووای قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی و ڕاوەدوونانی ڕووناکبیرە کوردەکان لەلایەن ڕژێمی تورکیاوە، پەیتا پەیتا، گەڕانەوە بۆ کوردستان.

– ژیانەوە ( ڕ. سلێمانی /١٩٢٤ ـ ١٩٢٦).

## ١٩٢٣/٧/٢٣

– لە کۆنفرانسی (لۆزان)دا، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دووای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە کوردەکان نایانەوێ لە تورکیا جودا ببنەوە و تورکیاش بەڵێن دەدات کە مافە نەتەوەییەکانی کوردەکان وەدی بهێنێت؛ لە پەیماننامەی (لۆزان)دا بەندەکانی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤)ی پەیماننامەی سیڤەریان هەڵوەشاندەوەو خەونە جوانەکەی شەریف پاشایان زیندەبەچاڵ کرد.
– بەپێی پەیمانی سیڤەر (١٩٢٠ کە تێیدا بەڵێن درابوو دەوڵەت بۆ کورد دامەزرێت) هەڵوەشێندرایەوە: کێشەی کورد لە عیراق لکێندرایە عیراقەوە، لە ئێران سپاردرایە دەستە خوێناوییەکانی شای ئێرانەوە، لە تورکیاشدا کەمال ئەتاتورکی کوردکوژی سەرۆک کۆماری تورکیا ڕایگەیاند «تورکیا تەنیا هی تورکانە»
– دامەزرانی «کۆماری کوردستانی سوور»ی ئۆتۆنۆم لە چوارچێوەی یەکیەتیی سۆڤیەتدا.

– ١٩٢٣/٣/٤ بۆمبابارانی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە و وەدەرنانی هێزی شێخ مەحموود بەرەو ئەشکەوتی جاسەنە. لە ٥/١٦ ئینگلیز هاتنەوە ناو سلێمانی. ئەوکاتە کە سمکۆ، ماوەیەک میوانی شێخ مەحموود بوو، لە ٢/٢٨ گەڕایەوە کوردستانی ئێران.

**١٩٢٤**: کەمال ئەتاتورک لە تورکیا بەیەکجاری زمان و کولتووری کورد و جەژنی نەورۆز قەدەغی کرد، هەرچی ڕووناکبیر و گەورەپیاوی کورد هەبوون یان ئیعدامی کردن یان نەفی یانیش ناچاری کردن خۆیان ڕابکەن لەدەست سێدارە: بەرەو ئەورووپا و شام و عێراق و ئێران. لەشکری تورکی بەردایە گیانی کورد!
– هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پەرلەمانی عیراقی کە تێیدا (١٧) کورد ئەندام بوون
– دووبارە بۆمبابارانی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە

## ١٩٢٥

– حسێن حوزنی موکریانی چاپخانەی(زاری کرمانجی)ی لە ڕواندز دامەزراند و گۆڤاریکیشی دوواتر بەو ناوە دەرکرد. ناوبراو یەکەم نووسەری کوردی هاوچەرخە کە کتێبی خۆی بە تەختیت و نیگار و وێنەی فۆتۆگرافی و نەخشەی جوگرافیای کوردستان ڕازاندبێتەوە: (غنچە بهارستان) زیاتر لە (٢٠) تابلۆی تێدایە.

– یەکەمین کتێب بە زمانی کوردی کە چەند تێدا دروست کرابێ و بلاو کرابێتەوە، کتێبەکەی مێژونووس حوسێن حوزنی موکریانی بە ناونیشانی غنچە، بهارستان (٣٦ ) ئەمەش لە سالی ١٩٢٥ دا.

– ١١ی ئازاری ١٩٢٥ گۆڤاری «دیاریی کردستان» لە بەغدا سالح زەکی ساحێبقران بە کوردی و عەرەبی تورکی.

– ١/ ٧ /١٩٢٥: لە ژمارە ٢٩ی رۆژنامەی ژیانەوەدا تا ژ ٢٦ هەروەها پاشان لە ژمارە ١ی رۆژنامەی ژیان ( ٢٩/ ٧/ ١٩٢٦) تا ژمارە ٢٦، لە سلێمانی یەکەم نۆڤلێتی کوردی بە زنجیرە بە ناونیشانی لەخەوما بە قەلەمی جەمیل سائیب (١٨٨٧ـ ١٩٥٠) بلاودەکرێتەوە.

– گۆرانیبێژ، مام هۆمەر، بۆ یەکەم جار لە مێژووی هونەری کوردیدا، لە بەغدا، قەوانی (هەیبەلار)ی دەرکرد

– دروستبوونی دێدەوانی لە سلێمانی

– یەکەمین تیپی مۆسیقا لە سلێمانی بە سەرپەرشتیی عبدالواحد نوری و فوئاد ڕەشید بەکر.

– پیرەمێرد، دووای ٢٥ سال دوورەولاتی لە ئەستەمبۆلەوە دەگاتەوە سلێمانی.

– بەختیار زێوەر یەکەمین شیعرەکانی خۆی نووسیوە.

– لە ئەرمەنستانی یەکیەتی سۆڤیەت، میکائیلی ڕەشید شیعری نوێ بلاودەکاتەوە.

و دووبارە گرتنەوەوەی سلێمانی کە پێشتر شێخ مەحموود هاتبۆوە ناوی بۆ حوکمرانی کردن. لە ١٩٢٤/٧/١٩ بەیەکجاری کۆتایی بە دەسەلاتی شێخ مەحموود هات.

## ١٩٢٥

– سەرهەلدانی ڕاپەڕینەکانی شێخ سەعیدی پیران کە لە کۆتایی سالدا بە دیل دەیگرن و لە سێدارەی دەدەن

– ١٦کانوونی دووەمی ١٩٢٥ لیژنەیەکی نێودەولەتی لەسەر داخوازیی کۆمەلی گەلان گەیشتنە بەغدا بۆ ئەوەی بێنە کوردستان لەبارەی کێشەی ویلایەتی مووسل و کوردستان بکۆلنەوە. کۆمەلەی نەتەوەکان رازی دەبێت کە کوردستانی باشوور (ویلایەتی مووسل) لە سەرداخوازی بریتانیا بدرێتە دەلەوتی عیراق.



سەید ڕەزا، کوردستانی تورکیا

- کتێبی (گۆرانیی کوردی) کە چەند سروودێکی نیشتیمانییە و ناوی نووسەری بەسەرەوە نیە.
- ئەحـــمـــەد نالبـــەند: جـــەســـارەت لەرووی وەسفکردنێکی رووتی سێکس و لەشی ئافرەت.

## ١٩٢٦

- یەکەم جار چیرۆکنووسێکی کورد کۆمەڵە چیرۆکی خۆی بلاوبکاتەوە: عـیـسا عـەلی ( حوسێن حوزنی موکریانی ؟): چیرۆک بە شێوەی شیمال (کەڵەکۆک)، رواندز، ١٥ لاپەرە. کەڵەباب؛ هەروەها حوسێن حوزنی مـوکـریانی: خـۆشی و ترشی، کـورتە چیـرۆکـێکە بۆ منداڵان، گفتوگۆیەکە لەنێوان گورگ و مەڕ و بزنێک (یەکەم چیرۆکە بۆ منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا.
- دەرکەوتنی گۆڤاری زاری کرمانجی کە لە ماوەی تەمەنیدا ٧٨ شیعری بلاوکردۆتەوە. هەر لەوێدا لە ژمـــارە (٥) بە پێنووسی (ز.ع. هەروتی) ژانرێکی شیعریی نوێ (پەخشانەشیعر) بلاودەکرێتەوە لەژێر ناوی (شیعری مەنسوور ).
- دەرکەوتنی رۆژنامەی ژیان لە سلێمانی ( ژ ١: ٢١ /١/ ١٩٢٦ـ ژ ٥٥٣: ١٠ /٣/ ١٩٣٨).
- کـۆمـەڵەی زانستـیی کـوردان لە سلێـمـانی لە ٢٤ /٢/ ١٩٢٦، کە ئەحمەدیەگی تۆفیق بەگ و کەریم زانستی و رەفـیق حـیلمی دایانمەزراندووە. تیـپی شانۆیی قوتابخانەی زانستی کە سەر بە جەمعیەی زانستی بوو لە سلێمانی چەندین بەرهەمی شانۆیی هەبووە. جگە لە پیشاندانی فیلمی سینەمایی.
ـ شانۆگەرییەک بە ناوی جووتە برا (عیلم و جەهل لولا المحامی)، لە نووسینی تقی الدین اللبنانی، لە هاوینی ١٩٢٦دا، لە سلێمانی پیشاندراوە. مەحموود جەودەت دەریهێنابوو. عەبدولواحید نووری و فوئاد رەشید بەکر دەوریان تێدا بینیوە.
- رەخنەی ئەدەبی و رەخنەی هونەری شـێـوەکـاری، یەکەم جار شێخ نووری شێخ سالح (١٨٩٦ـ ١٩٥٨) دایهێناوە. ئەمەش لەو زنجیرە وتارەی بە ناونیشانی

## ١٩٢٦/٢/١٢

- عصبە الامم داخوازیی لە بریتانیا کرد کە کورد بە زمانی خوی بخوێنێت. نوێنەری بالای بریتانیا لە نامەیەکی نهێنیدا پێشنیاری بۆ سەرەک وەزیرانی عیراق کرد کە نووسینگەیەکی تەرجەمەی کوردی لە بەغدا بکرێتەوە، هەروەها تەرجەمەی قانوون و کتێبە قوتابخانەییەکان بۆ کوردی بکرێت.

## ١٩٢٦/٦/٢٢

رێککەوتنێک لەنێوان تورکیا و ئێران لە تاران: هەموو بزاڤێکی نەتەوەیی کوردی لەناو ببەن!

**١٩٢٧**: سەرهەڵدانی راپەرینەکانی ئارارات بە سەرۆکایەتیی ژەنەراڵ ئیحسان نووری پاشا کە تا ١٩٢٩ درێژەی کێشا

٥ی تشرینی یەکەمی **١٩٢٧**: **«خۆیبوون»**
پاش سەرکوتکردنی شۆرشی ١٩٢٥ی شێخ سەعیدی پیران لە کوردستانی تورکیادا، سەرۆک عەشیرەتە شۆڕشگێر و بەرپرسی رێکخراوە سیاسییەکانی کورد، زۆربەیان، لەلایەن رژێمی ئەتاتورکەوە ئاوارەی عێراق و ئیران و سوریا و لوبنان کران. لە کۆتاییدا پەیوەندییان بە یەکتر کردەوەو بریاریاندا «کۆنگرەیەکی نەتەوەیی»دا ببەستن. یەکەم دانیشتنی کۆنگرە، لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا پێنج رۆژی خایاند، لەوێ لەسەر پرنسیپە بنچینەییەکان رێککەوتن، لە هاوینەهەواری (بیحەمدوون) لە لوبنان، تا ٢١ی مانگ درێژەیان بە کۆبوونەوەکان دا. لەم کۆنگرەیەدا نوێنەرانی ئەم چوار رێکخراوە کوردییە بەشدار ببوون: کورد میللەت فیر قەسی؛ کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعی کورد.؛ کۆمیتەی ئیستیقلال؛ کۆمەڵەی کوردوکوردستان. بەپێی بریارەکانی کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی

"ئەدەبیاتی کوردی" لە رۆژنامەی ژیان بە ٢٥ ئەلْقە بلاوکراوەتەوە لە سلێمانی. نووسەر لەم بەرهەمەیدا هەموو بەشەکانی هونەرە جوانەکان "صەنایعی نەفیسە" (نیگارکێشان، مۆسیقا، پەیکەرتاشی، بیناسازی، وێنەگەری) شیدەکاتەوە .

– ئەنجوومەنی مەعاریف جەلسەی حەوتەمی کردووە لە ٢٩ /٣ /١٩٢٦ لە ریاسەتی مەتصرفدا، بریاردراوە مەکتەبێکی کچان بکرێتەوە و لە ٢١ی نیسانەوە دەستدەکرێ بە قەید و قبووڵی قوتابیی کچ.

– کۆمەڵی بژاری زمانی کوردی لە سلێمانی لەپێناو پاککردنەوەی زمانی کوردی لە بێگانە.

– لە هەولێر ناوی لیجنەی فەن و تەمسیل بووە لیجنەی فنوونی جەمیلە کە لە کۆتایی بیستەکاندا و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند.

## مانگی ئەیلوولی ١٩٢٧

– ئەوکاتەی مەجید یەعقوبی پارێزگار بوو، یەکەم قوتابخانەی کچان لە هەولێر لە گەڕەکی قەڵا لە نزیک دەرگای ئەحمەدیە کرایەوە. تەنیا یەک پۆل بوو، ٣٥ قوتابی بوون. لە ١٩٢٨ پۆلی دووەم کرایەوە.

– مەحموود شەوقی، باوکی ئازاد شەوقی، لە سلێمانی، کاریکاتێر و رەسمی کردووە.

– کتێبخانەی عومەر قەزاز کتێب رۆژنامە و گۆڤار و قەوانیشی دەفرۆشت

– ٤٤ قوتابخانەی کوردی لەسەر خاکی یەکیەتی سوڤیەت لە کۆتایی بیستەکاندا دامەزران.

– کابرایەکی ئەرمەنیی رەسسام، لە کۆتایی ساڵانی بیستەکاندا لە هەولێر هەبوو، رەسامێکی زۆر گەورە بوو، کوردی ئەودیو، ناوی جهانگیر بووە. دیمەنی سروشتی کوردستان و جوانی کوردەواریی دەکرد، " دانیال قەصابی هونەرمەند، لە هەمان ئەو ساڵانەدا، لەژێر تەئسیری ئەودا هاتە مەیدانی هونەر". هەروەها نیگارکێشێکی دیکە لە هەولێر کاری کردووە بە ناوی ئیسحاق هەولێری.

(خۆیبوون) بڕیاریان دا کە هەموو کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسییە کوردییەکانی پێشوو هەڵبوەشێننەوە و هەموویان بڕژێنە ناو ئەم کۆمەڵە تازەیەوە؛ یەکگرتوو، لەرێگەی ئەم کۆمەڵەیەوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێبکۆشن.

### ١٩٢٨/٦/١

ئەمین زەکی بەگ، بە ئیمزای خۆی و ئیمزای عبدالله موفتی (نائیبی هەولێر)، محەمەد ساڵح (نائیبی سلێمانی)، محەمەد جاف و سەعید وەنداوی ( نائیبی کەرکووک)، ئیسماعیل رواندزی و مەعرووف جیاوک، یاداشتێکیان پێشکەش بە وەزارەتی مەعاریفی عیراق و پەرلەمانی حکوومەتی عێراق کرد بۆ ئەم داخوازییانە:

١ـ کۆمەڵێک دابنرێ بۆ دانان و وەرەگێڕانی کتێبی قوتابخانەکان بە کوردی و هەرکەسێک کتێبی لەسەر دەستووری مەعارف کردە کوردی ٥٠٠ روپیە بەخشیشی بدرێتێ.

٢ـ وەدەستهێنانی مامۆستا.

٣ـ لە مەنتیقەی شیمال دائیرەی مەعاریف بکرێتەوە و ئەویش دەبی لە ناوەڕاستی مەنتیقەکەدا بێ.

٤ـ دەبێ لە مەنتیقەکەدا مەدرەسەی دارالمعلمین تەشکیل بکرێ.

٥ـ مەدرەسە بۆ ئینات بکرێتەوە.



- بەختــيــار زێوەر شــيــعــری گــۆرانيی تانجــەڕۆ هەوڵدانێکە بۆ شيعری ئازاد.

- ڕەشــيــد نەجــيب بە نـاوی (فــەرامــەرز) يەكــەمين شيعرەكانی خۆی (عەشق و خەياڵ) لە ژمارە (٩٤)ی ژيان دا، پاشــان (ئالامی بەشــەر) و (ئيـنتــبــاعــاتی هەورامان) هەر لە ژيان بڵاودەكاتەوە. ئەوەی يەكەميان بە نوقتەگۆڕانێک دەژمێردرێت لە ڕێڕەوی تازەكردنەوەی شيعری كورديدا.

- لەدايكبوونی ديلان (١٩٢٧ - ١٩٩٠)

## ١٩٢٨

- ڕێكخراوی (خۆيبوون) لە ڕۆژی دامەزراندنيەوە تاكو ١٩٢٨/٦/٢٠ زياتر لە (٧١) بەياننامە و بانگەوازی بە توركی عوسمانلی، فەڕەنسی، عەرەبی، ئينگليزی بڵاوكردۆتەوە. يەكەمين چاپكراوی خۆيبوون لە شێوەی ناميلكە(كتێب)دا بە فەڕەنسی و ئينگليزی چاپكراوە: (ياداشتنامەيەک لە بارەی كوردستان، لەگەڵ پاشكۆيەک)، قاهيرە: ١٩٢٨.

- دانانی ئەلفوبێی كوردی لە ئەرمەنستانی يەكيەتی سۆڤيەت.

- دووەم نۆڤلێتی كوردی، بە ناونيشانی مەسەلەی ويژدان، نووسراوی ئەحمەد موختار بەگی جاف.

- يەكەم وتاری تەرخانكراو بە زمانی كوردی لەبارەی ڕەسم لەلايەن حوسێن حوزنی موكريانی كە ويستوويەتی ڕۆشنبيرييەكی شێوەكاری بە زمانی كوردی بڵاوبكاتەوە.

ـ پيشاندانی شانۆگەريی قەلەن (شيربايی) لە شاری تفليس (لە گورجستانی يەكيەتی سۆڤيەتی پێشوو).

- شانۆگەريی بەدرەوشتی؛ ئامادەكار: فوئاد ڕەشيد بەكر، لە هەولێر ( زاری كرمانجی باسی دەكا).

پيرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) بۆ يەكەمين جار لە مێژووی ئەدەبی كورديدا، دەست دەداتە پێنووس و ژانری شانۆنامە ( پيەس، تەمسيل، درام) بە خوێنەرانی كورد دەناسێنێ و يەكەمين ڕەخنەی شانۆيی بڵاودەكاتەوە:

«فەننی تەمسيل، لە هەموو جێگايەكدا ڕەغبەتێكی تەواو و ئيمتيازێكی موناسيبی دراوەتێ. حەتتا ئەوانەی كە لەم فەننە بەقيمەتەدا دەسدێژی و ئيختيساسيان پەيداكردووە، بە كەماڵی ئيحتيرامەوە ياد و تەقدير كراون. زيرا ئەم فەننە، بەسەر ئەخلاقی ميللەت، عاداتی مەملەكەت، ئەطوار و ئەفكاری ئينساندا تەئسيرێكی باش ئيجرا ئەكا».

ڕۆژنامەی ژيان، ڕۆژی سێ شەممە، ٢ی ئاغستۆسی ١٩٢٧



شێخ سەعيدی پيران

## ١٩٢٩

- ڕەشـــیـــد نەجـیـب لە ١٩٢٩ نازناوی (گـــۆران) دەبەخشێتە عەبدوللا بەگی شاعیری نوێخواز.
- لە ئەرمـەنسـتـانی یەکـیـەتی سـۆڤـیـەت، کارلینێ چاچان «شیعری نوێ» بڵاودەکاتەوە.
- تیپی نواندنی (مـەکـتـەبی تفـیـضی ئەهلی)، بە سـەرپەرشـتــیی حـقی الشــبلی لە هاوینی ١٩٢٩ هاتوونەتە هەولێر و سلێمانی، شانۆگەرییان پێشکەش کردووە.
- لەدایکبــوونی کــامــەران مــوکــری (١٩٢٩-١٩٨٦)

**١٩٢٩/٨/٥**: ڕۆژنامــەی ژیان، ژمــارە ١٩٠: وەزارەتی مەعـاریف ئەم ساڵ بیست طەلەبە ئەنێری بۆ دارالفنوونەکــانی ئینگلتــەرە، ئامــریکا، بەیرووت، میسـر. ئەمانە لە فەننی تەربیە و تەعلیم، هەندەسە، ئەلکتریک و زراعەتدا تەحصیل ئەکەن.

**٧ی کـــانوونی دووەمی١٩٢٩**: دووا بە دووای ئەوەی کـە شـانۆگـەریی (وێنەتی) لە شـاری هەولێـر، لەلایەن قوتابییانی سانەویی هەولێر پێشکەش دەکرێت، حوسێن حـوزنی مـوکـریانی، لە (زاری کـرمـانجی) لە ژمارە ١٦دا، بایەخی شانۆ بۆ خەڵک ڕووندەکاتەوە.

## ١٩٣٠/١/١

- ئەلفـابێی لاتینی لە ئەرمـەنسـتـانی یەکـیـەتی سۆڤیەت، کە لەلایەن عەرەبی شەمۆ و مارە گۆلێفەوە دروستکرابوو، بەشێوەیەکی ڕەسمی کەوتە کار. پاشان لە ١٩٤٦ گۆڕا و بووە ئەلفابێی سلاڤی.
- ڕۆژنامـەی ریا تازە (یەریڤـان ١٩٣٠- ١٩٣٨ و ١٩٥٥ - ١٩٩٣.
- لە مانگی مارتی ١٩٣٠، فوئاد ڕەشید بەکر، لە سلێـمـانی، کـورتە نمایشـێکی نیـشـانداوە بە ناوی

## ١٩٢٩

هەڵوەشاندنەوەی کـۆمـاری سـووری کـوردسـتـان بە بڕیاری ستالین

## ١٩٣١/١٢/٩

ڕاپەڕینی بارزان

## ١٩٣٢

- بەردەوامبوونی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکانی بارزان بە سـەرۆکـایەتیی (شێخ ئەحـمـەدی بارزانی) و مـەلا مستەفای بارزان.



Mustafa Kemal and Diyap Aga, the Kurdish representative to the Grand National Assembly from Dersim

سەید ڕەزای دێرسیمی ڕێبەری کورد ڕووبەڕووی کەمال ئەتاتورک

(مامۆستای کۆن).
- قوتابخانەی کچانی هەولێر، بینایەکەی، جێگەی پۆلی چوارەمی تێدا نەدەبۆوە، بۆیە گواسترایەوە تەنیشت خەزانەی ئاوەکەی ناو قەلاّ. لە ١٩٣٢ ـ ١٩٣٣ پۆلی سێیەم کرایەوە و ناوی لێنرا مدرسە اربیل الابتدائیە للبنات.
- یەکەمین وێنەگرەکانی سلێمانی کە لەناو شار ستۆدیۆی وێنەگرتنیان لە سالاّنی (١٩٣٠)دا لەسلێمانی کردۆتەوە، ئەرمەنی و جوولەکە بوون.
- لە سەرەتای سالاّنی ١٩٣٠ کۆمەڵەی گەنجانی کورد لە پاریس: شانۆگەریی مەم و زین.
- رەشید نەجیب لە رۆژنامەی (ژیان)دا زنجیرە وتارێک بە ناونیشانی (ئەدەبی کوردی) بلاّودەکاتەوە و داوا دەکات کە بۆ بووژاندنەوەی ئەدەبیاتی نەتەوەییمان پێویستە بگەڕێینەوە بەرەو ئاڤێستا. داوا لە نووسەر و شاعیران دەکات کە بۆ تازەکردنەوە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئەدەبیاتی فۆلکلۆری و کێشی پەنجە و بەیتە کوردییەکان «چونکە ئەم تەبەقەیە لە حسیات و خووی رەسەندا پاکترین تەبەقەی کوردن و لەگەڵ بێگانەدا تێکەڵ نەبوون، ئاسار و شیعرەکانیان نموونەیەکی خاوێن و ئەسڵێ ئەدەبیاتی کوردییە».
- لە ٤/٦/١٩٣٠ یەکەمین شیعری فەرەنسی کە تەرجەمەی کوردی بکرێت: شیعرێکی شاعیری پەرناس سوللی پرۆدووم بە پەخشان لەلایەن مەحموود جەوودەتەوە بە ناونیشانی (نەهاری خوێنین) لە ژمارە (٢٣)ی گۆڤاری زاری کرمانجی بلاّوکراوەتەوە.
- دیوانی مەلا محەمەدی کۆیی، رواندز، چاپخانەی زاری کرمانجی.
- کۆمەڵەی لاوانی کورد لە بەغدا، کۆمەڵەی برایەتی لە سلێمانی؛ هەروەها لەناو قوتابخانەی فەیسەڵیەشدا لە سلێمانی: یەکەمین تیپی تۆپی پێ.
- لە ١٩٣٠ ـ ١٩٣١دا لە رواندز شانۆگەریی نیرۆن پیشاندراوە. کۆمیدیایەکی نۆ پەردە بووە، دوو رۆژ بۆ پیاوان، رۆژێک بۆ ژنان بووە.

ئەو سەردەمەی ئێمە تێیدا دەژین سەردەمی سەرکەوتن و بەرزبوونی عیلم و فەنە، سەردەمی تەئلیف و کتێب و نەشری مەعاریف و چاپەمەنییە..
زاری کرمانجی، (٢٣)، ساڵی ١٩٣٠



ئەحمەد موختاربەگی جاف:
لانەواز و بێکەس و مەزڵوومن ئێستە قەومی کورد
گا بەدەستی تورکەکان و گا بەدەستی ئێرانەوە
ئیسمی ویژدان و عەدالەت بێ موسەممایە و درۆ
بۆ سیاسەت ئەم قسە کەوتۆتە سەر لێوانەوە
راستە گەر ئیسمی عەدالەت بۆچی منداڵانی کورد
وێڵ و سەرگەردان بسوورێن بەسەر کێوانەوە
هێندە حیزە بەختی کورد بۆ کوشتن و تالاّنیان
کۆمەڵێ هاتوون بە سواری وشتری پێ پانەوە
حاڵی کورد ئێستە لە بەینی تورک و ئێران و عەرەب
بێچووە تەیرێکە کە کەوتە داوی منداڵانەوە
ئەمرۆ با وابێ بەڵام رۆژێ ئەبێ ئەولادی کورد
دێنەوە مەیدان بە عیلم و سەنعەت و عیرفانەوە
نەوجەوانانی وەتەن تەوحید ئەکەن ئەم میللەتە
هەر لە کرماشان هەتا ورمێ و سنە و بۆکانەوە

**١٩٣١ :** یەکەم چیرۆکی تەرجەمەکراو کە بە کتێب بڵاوکرابێتەوە: سەرهاتیا جاسم. حاجی جندی و ئەمینێ عەڤداڵ لە نووسینێکی لازۆ ی ئەرمەنییەوە کردوویانەتە کرمانجی، بە پیتی لاتینی: یەریڤان.

- دیوانی نالی، چاپی کوردی و مەریوانی، بەغدا
- دیوانی کوردی، بەغدا
- بەستنی کۆنگرەی مۆسیقا لە قاهیرە کە عەلی مەردان بەشداریی تێدا کرد.

## ١٩٣٢

- دەرکەوتنی دانیال قەصاب لە هەولێر وەک یەکەمین نیگارکێشی مۆدێرن.
- یەکەم پێشانگای هونەری رەسم لە سلێمانی: عەزیز سەلیم یەکەم پێشانگەی تایبەتی خۆی لە قەبرستانی شێخ جەعفەر کردۆتەوە.
- حەسەن فەلاح، ئەو کاتە تەمەنی بیست و دووساڵ بووە، لەسەر دیواری ماڵ و چایخانە و دیواری ناوبازاڕەکان رەسمی دەکرد (لە سلێمانی و لە بەغدا).
- لە هەولێر (لیجنەی فنوونی جەمیلە) لە سانەویی هەولێر، توانی بۆ خۆی ژوورێک تەرخان بکات و مەرسەمێک (ستۆدیۆی رەسم) بۆ یەکەمین جار لە شاری هەولێر دابمەزرێنێ.
- پیرەمێرد شانۆنامەی مەم و زین (کە دەبێتە دووەم شانۆنامە لە ئەدەبی کوردیدا) لە ١٩٣٢ بە زنجیرە لە ژیان دا بڵاودەکاتەوە. پاشان لە ١٩٣٥دا دەخرێتە سەر شانۆ.
- لە هەولێر، شانۆی کچی کوردستان لە ١٩٣٢ نیشاندراوە.
- لە ساڵی ١٩٣٢: (٩ ) شانۆگەری لە هەولێر، (٨) لە سلێمانی، (١) لە رواندز، (٢) لە کۆیە پیشان دراوە.
- بڵاوبوونەوەی یەکەمین شیعرەکانی ئەمینی عەڤداڵ لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت.


خنچۀ بهارستان ٢٨

کرد واسلامیت

کردستان بە اکثریت اسلا-
میتان قبول کردە وە بە شرو-
طاێکی تەواو وشعبە یکیان هیە
کە قبولیان نە کردە بیت اوا
نیش زورکن اوانۀ اسلامیتیان
قبول نە کردە بیت هندیکن
مشابۀ مجوسی ایرانیان هیە لە
میانیکی ابتدائە دا دە ژین
اوانیش ناکینە نمونە بو کردی
اصلی چونکە اوانیش لە ژیر
وجدانی اجتماعیۀ کردی اسلامدا

سەرەوە: خونچەی بەهارستان ؛ ح. ح. موکریانی
خوارەوە: پێشەوا قازی محمد



١٥-٥-١٩٣٢: پیرەمێرد: تەفرە و چاو و ڕاوی پف هەڵدراو، ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٣٨)؛ کە هەوڵدانێکە بۆ تازەکردنەوەی شیعری.

## ١٩٣٥ ـ ١٩٣٢

ـ بڵاوبوونەوەی ٥٧ ژمارە لە گۆڤاری هاوار (ژ ١: ١٩٣٢- ١٩٣٥؛ ژ ٢٧: ١٩٤١- ١٩٤٣) لە دیمەشق. لەوێدا چەندین چیرۆکنووس و شاعیری نوێ دەردەکەون: کامەران بەدرخان، جەلادەت بەدرخان، مستەفا ئەحمەد بۆتی، عوسمان سەبری، قەدریجان، جگەرخوێن، نوورەدین زازا.. کە هەر یەکەیان دەیان شیعر و چیرۆک و وتار بڵاودەکەنەوە. ئەم نەوە نووسەرە تازەیە کاریگەرێتیی خۆی بەسەر نووسەرانی کوردستانی عیراقسدا دەنوێنی، بەتایبەتیش بەسەر پێگەیاندنی عەلائەدین سەجادی و شاکیر فەتاح و ئیبراهیم ئەحمەد و عەبدولخالیق ئەسیری و بێکەس و گۆران کە هەموشیان بەرهەم لەوێدا بڵاودەکەنەوە. کوردناسی فەرەنسی، ڕۆژە لسکۆ، ناو لەم جموجۆڵە گرنگە دەنێت "قوتابخانەی دیمەشقی" لە ئەدەبی کوردیدا کە گۆڤارەکانی ڕۆناهی ١٩٤٢- ١٩٤٥ و ڕۆژا نووش ٤٣-١٩٤٦ دەگرێتەوە کە لە ساڵانی ١٩٤٠ لە شام دەردەچوون.

هاوار لە (٥٧) ژمارەی خۆیدا (١٨٧) شیعری بڵاوکردۆتەوە. هەروەها چەندین هەوڵدان بۆ نووسینی شیعری ئازاد و بەکارهێنانی کێشی ئازاد بەتایبەتی لەلایەن کامەران بەدرخانەوە لە ساڵی ١٩٣٢ لە (ژ ٨، ل ٣) شیعری (ستنرانا دلان).



سەرەوە: گۆران
خوارەوە: عبدالواحید نووری



## ١٩٤٩ -١٩٣٩

گۆڤاری گەلاوێژ: عەلادین سەجادی، ئیبراهیم ئەحمەد، شاکر فەتاح

″ ŁU W


– د. عزالدين مصطفى رسول: الواقعيه فى الادب الكردى، بيروت: ١٩٦٦
– محمدامين زكى بگ: خلاصه تأريخ الكرد و كردستان، ج (١) و (٢)، ترجمه من العربيه الى الكرديه (محمد على عونى).
– زنار صلوبى: فى سبيل كردستان، ت: د. رظوان على، دازالكاتب، بيروت: ١٩٨٧، ص ٢٢.
– د. جليلى جليل: نهظه الاكراد الثقافيه، ت: ولاتو، دمشق: ؟. هەروەها د. عبدالستار طاهر شريف: تاريخ الاحزاب و المنظمات الكورديه ١٩٠٨-١٩٥٨، شركه المعرفه. بغداد: ١٩٨٩.
– د. وليد حمدى: الكرد فى الوثائق البريطانيه، لندن: ١٩٩١.
– د. فرهاد پيربال: دراسات حول تاريخ الكورد، ت: ترزه جاف، دار كاوا، بيروت: ١٩٩٩
– ميريللا غاليتى: التراث الكردى فى مولفات الايطاليين، ت: د. يوسف حبى، گۆڤارى كۆڕى زانيارى عێراق، دەستەى كورد، بەرگى هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١، ل ٢٢٥ـ ٣٠٠.
د، يوسف حبى: كنيسه المشرق، گۆڤارى بين النهرين، ژماره ١٤ ـ ١٥، مووسڵ: ساڵى ١٩٧٦، ص ١٩ ـ ٢٩.
– عبدالكريم المدرس: علماءنا فى خدمه العلم، بغداد: ١٩٨٣.
– وليەم دو ڤريز: نشاه بطريركيه كرسى المشرق، تعريب: الاب د. سرهد جمو، بين النهرين، عدد: ٩ ـ ١٠، موصل
– حنا عبدالاحد روف: شعراء مسيحيون فى اربيل فى القرن الثالث عشر الميلادى، زاگروس، عدد ٢، اربيل: ١٩٩٧.
– سهيل قاشا: الموصل فى مذكرات الرحاليين الاجانب، بين النهرين، عدد ٥، موصل: ١٩٧٧
ـ م. سترک: دائره المعارف الاسلاميه، ماده اربل، طبعه مصر: ١٩٣٣، ص ٥٧٤.
– على اكبر فياض: گزنفن در بازگشت، مجلهء (يغما)، شماره (٥)، ص ٤٤٣-٤٩٣، طهران:؟١٩٥٩.
– حبيب الله صمدى : كردستان در چهل هزار سال پيش، مجلهء (بغستان) جلد اول. شمارهء اول، ص ٣٨-٣٩. طهران : ١٩٦٣.
– عبيدالله ايوبيان: مير نوروزى ( تاريخچه هنر تئاتر در كردستان ايران ـ قرن نوزدهم)، مجله نشريه دانشكده ادبيات تبريز، شماره ١٤، ص ٩٥ ـ ١٢٢.
– سيد حسن ناصر واحمد مستوفى وعباس زرياب: اطلس تاريخى ايران دانشگاه طهران طهران: 1971 (فصل ايلخانان ايران) ( ئەم كتێبە بە سێ زمانى فارسى و فەرەنسى و ئینگلیسی چاپكراوە).
– كورد لە كەيەكەوە خەريكە، و لە توركييەوە: عەلى عيرفان، بەغدا: ١٩٢٧، ٢٧ ل.
– محەمەدى مەلا كەريم: عەقيدەنامەى كورديى مەولانا خاليدى نەقشبەندى، گۆڤارى كۆڕى زانياريى عيراق ـ دەستەى كورد، بەرگى هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١.
– جەليلى جەليل: هەندێ سيماى ژيانى كۆمەڵايەتى و سياسى و كولتووريى كورد لە كۆتاييەكانى سەدەى نۆزدەم، و: ئەنوەر قادر محەمەد، ستۆكهۆڵم: ١٩٩٣.
– عەبدولڕەزاق بيمار: مێژووى پەخشانى كوردى. بەغدا: ١٩٩٩
– عبيدالله ايوبيان: چريكەى كردى، نشريه دانشكده ادبيات تبريز، شماره تابستان، ١٣٤٠. (١٩٦٣).
– ئەكرەمى مەحموودى ساڵحە رەشە: شارى سلێمانى، بەرگى دووەم، بەغدا: ١٩٨٩.
– ئەحمەد سەعيد ئەحمەد: كورتەيەک لەبارەى هونەرى خۆشنووسى، رۆشنبيرى نوێ، ژ ١٠٩، س ١٩٨٦
– عبدالكريم المدرس: بنەماڵەى زانياران، بغداد: ١٩٨٤.
– جەمال نەبەز: زمانى يەكگرتووى كوردى، بڵاوكراوەكانى يەكيەتيى نەتەوەيى خوێندكارانى كورد لە ئەورووپا، بامبێرگ ( ئەڵمانياى رۆژئاوا: ١٩٧٦، ل ٧٨ ـ ٨٧.
– كەمال مەزهەر: چمكێک لەبارەى يەكەم چاپخانەى كوردى لە شارى سلێمانى، كتێبى (چەند لاپەرەيەک لە مێژووى گەلى كورد). بەشى يەكەم، د.ڕ. ب. ک. بەغدا: ١٩٨٥، ل ١٥٣.
– كەمال ڕەؤووف محەمەد: ئەدەبى نامەنووسينى كوردى، ٣ بەرگ، دەزگاى ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٤
– عبدالرقيب يوسف: بەشێک لە ژيان و بەرهەمى رەنجوورى، رۆشنبيرى نوێ، ژ ١٠٧، س ١٩٨٥، ل ٦٢ ـ ٧٥.
– مستەفا نەريمان: كتێبى كورديى قوتابخانەكانمان، گۆڤارى رۆشنبيريى نوى، ژماره ( ١١٠)، بەغدا: ١٩٨٦، ل ٨٦ ـ ٩٦.
ـ نووسەرێک: مەكتەبەكانى سلێمانى، دوێنى و ئەمرۆكە، گۆڤارى زارى كرمانجى، ژماره (٢٢)، ٣٠ى نيسانى ١٩٣٠.
ـ نووسەرێک: پێشكەوتنى زانستى لە سلێمانى لە زۆر كۆنەوە، رۆژنامەى ژين، ژماره ١٢٤٧، سلێمانى: ١٩٥٥.
– د. عيزەدين مستەفا: سەرنجى لە زمانى يەكگرتووى كوردى، بەغدا: ١٩٧١، ل ٣٥

– عبدالله بابەکر حەمەد ئاغا: رۆژنامە و رێکخراوە کوردییەکانێ تورکیا ، لە تورکییەوە ئامادەێ کردووە، کاروان، ژمارە ٦٤ ، ١٩٨٨
– د. کەمال مەزهەر: ماتێنەدەران، بەیان، ژ ٣٠ ، بەغدا: ١٩٧٥ ، ل ٧ـ ١٠.
– رەشید فندی: عەلی تەرەماخی: ئێکەمین رێزکماننڤیس و پەخشاننڤیسی کوردە، بەغدا، ١٩٨٥
– ئومێد ئاشنا : گۆڤاری بانگی کورد، سلێمانی: ١٩٩٦ ، ل ٤.
– سەباحی غالیب: دوو تەقەلآی بێ سوود، چاپخانەی هەڵوێست، لەندەن: ١٩٨٤
– د. جەمال رەشید: لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی بەغداد. ١٩٩٨
– نووسراوەکانی پیرەمێرد لە ڕۆژنامەی (ژین) ژمارەکانی (٨٩٣) و (٩٦٧) و (٩٨٣) (١٩٤٧)، سلێمانی: ١٩٤٧-١٩٤٩.
– عبدالرزاق بیمار: دانیشتنێک لەگەڵ گۆران، گ، بەیان، ژمارە ٢ ، بەغدا: شوباتی ١٩٧٠ ، ل ٣.
– شێخ نووری شێخ سالّح: " ئەدەبیاتی کوردی" رۆژنامەی ژیان لە سلێمانی، ژ ٢٤ و ٢٥ ، ٢٨ ، ١٥ی تەمموز و ١٢/٨/ ١٩٢٦.
– رفیق حیلمی: شعر و ادبیات، ب ١ و٢ ، بەغدا
– د. عزالدین مستەفا ڕەسووڵ: ئەدەبی نوێی کوردی، زانکۆی سلێمانی
– ئومێد ئاشنا : ڕەشید نەجیب، ئاراس، هەولێر: ٢٠٠١
– ئازاد عەبدولواحید– دیوانی شێخ نووری– بەرگی یەکەم– بەشی یەکەم و دووەم پیرەمێرد، لێکۆڵینەوە و دەرکردنی: محمد رەسول هاوار، بەغدا: ١٩٧٠ ، ل ١٥٥
– ئومێد ئاشنا : پیرەمێرد، بەرگی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠١ ، ل ٤٧.
– گۆران، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا ، ئارای، هەولێر: ٢٠٠٢
– فەیسەڵ دەباغ: یەکەم کۆمەڵەی کوردی، رۆژنامەی برایەتی، ژ (٢٩٤٦) رۆژی ١٣-١٠- ١٩٩٩ ، ل ٢.
– ئەحمەد تاقانە: تۆفیق فیکرەت و شاعیرانی کورد، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٣
– محەمەدی مەلا کەریم: عەقیدەنامەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عیراق ـ دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١.
– د. جەمال نەبەز: کوردستان و شۆرشەکەی / بنکەی ئازاد، ستۆکهۆڵم: (1985
– محەمەد تەیموور: شانۆ لە قوتابخانەکاندا، گ. ئوتۆنۆمی، ژ ٢٠ و ٢١ ، ١٩٨٤ ، ل ١٠٥ ـ ١١٢و ٧٦-٨٠.
– تاهیر ئەحمەد حەوێزی: شانۆگەری لە کوردستاندا، گ. رامان، ژ ٢٧ ، هەولێر: ١٩٩٩.
– مەغدید حاجی: ئافرەت لە شانۆی کوردیدا، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا: ١٩٨٩.
– کەمال رەئووف محەممەد: مستەفا سائیب ئەستێرە گەشەی کورد، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٨ ، ل ١٩.
– شێخ حسێنی قازی: مەولوودنامە، سلێمانی، ساڵی ١٩٣٥.
– ولیەم نیگلتۆن: کۆماری کورد، و: محەمەدی سەمەدی، کوردستانی ئێران: ١٩٦٣
– فایەق عومەر تۆفیق: بیبلیۆگرافیای شانۆنامەکانی سلێمانی و مێژووی تیپە هونەرییەکان، چاپی دووەم، سلێمانی: ١٩٩٥.
– جەمال رەشید: مرۆڤی چاخی بەستەڵەک، رۆشنبیری نوێ، ژ ١١١ ، س ١٩٨٦

Stanford SHAEW: Histoore de L Empire pttoman et la Turquie,Tome. 1. ed. Harvath paris: 1983

Addai SCHER: Histoire Nestorienne Chronique de Seert, Archeveque Chaledeen du Kurdistan, Paris: 1909.

Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.

CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4, Paris; 1857. 60 pages.

Morizio GARZONI: Grammatica e vocabulairio della lingua kurda, Rome: 1787.

A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Phi-: lologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

A. JABA: Ballade Kurde recueillie et traduite par A. JABA et communiquee par DE TCHITIATCHEFF in Journal Asiatique, Paris: 1859, 5e Ser., T. XIV, P. 153-166.

Mierlla GALLETTI: Curdi e Kurdistan in opere italiana del XIII-XIX, in Riv. ORIENTO MODERNO, Anno LVII, Nr. 11, Nov. 1978, P. 563-596.

Raphael J. Bidawid: Les ettres du Patriarche Nestorien Thimote 1, Cittadel Vatican 1956.

A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4, Paris; 1857. 60 pages.

Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860

Pierre RONDOT: Publication Kurde en caracteres latins Hawar, Revue Kurde in Bulletin d Etudes Orientals de l Institut Francais de Damas, T2, 1933, P. 3.

Roger LESCOT: Litterature Kurde, PP. 795-805, in Encyclopedie de la Pleade, Histoire des Litteratures, Vol. 1, ed. Gallimard, Paris: 1977, P. 903.

Emir Kamuran BEDE-RKHAN: Le Roi Du Kurdistan, Roman Epique traduit du Kurde Par Emir Kamuran BEDE-RKHAN et Adolphe de FALGAIROLLE, ed. OPHRYSGAP. Paris: 193?, 84 pages.

Thoas BOIS: Connaissance des Kurdes, Khayat, Beyrouth: 1965, P. 133.

Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.

Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.- 24

C.Le STRANGE: The Lands of the Esterm caliphate Cambridge at the Uni versty Press. 1950 p. 192.

La. Turquie Col Lection Monde et Voyages Edition Larousse. Paris: 1974 pp. 20 -21.

Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.- 24

V. MINORSKY. "Kurdes.pp. 1196- 1222"in (Encyclopedie de L Islam) dictionnire Geographdique Rthog. et. Biog. des peuples Musulmand. Tome 2. E.L.A PICARD editeut. Pares 1927. p. 1220.

C.Le STRANGE: The Lands of the Esterm caliphate Cambridge at the Uni versty Press. 1950 p. 5

A.SPIEGEL Eranisch Alertuni Col. Kartsew.B- Chevalier CHARDIN: Voyages du ch CHARDIN EN Perse 4 vol Amsrtsame: 1735,reedite a paris (1811)

Notices et Extraits des MANUSCRITS de la Bibliotheque du Roi Publied Paar Linstitut Royal de France Tome 13e Imp Royal Paris 1838 p. 305

G, Le STRANGE Mesopotamie and Persea Under the Mangol,London: 1903 . pp ,5 27, 52, 57,

DRIVER DISPERSION of rhe kurds in ansient times in (Joumal of the Royal Asiats Society) october 1921 pp 563 572.

Gerard CHALIAND. Atlas de la decouverte du monde, ed Fayard. Paris 1983, pp. 62.

ROBERT OSLON: THE EMERGENCE OF KURDISH NATIONALISM (1880-1925) U.OF TEXAS PRESS, USA: 1989 P 15

REVUE DU MONDE MUSULMAN V.X , PARIS: 1910, N, IV P 578.

BULLETIN ARMENIEN, N 18-19-20, P. 4 , PARIS: MARS 1920

The Cambridge history of Iran.V.2. The Medien and Achamenian Period, ed. by ILya GESCHVITCH, Cambridge university Presse, London_ Newyork_ Sydney: 1968?,P354, 365_359.

tome ll, Livre lV- Vll, Texte etabli et traduitr psar Paul Masqueray, ed. Societe d.:Xenophon: Anabase edition (Les Belles Lettres), Paris :1967.p.18.

Herkol Azizan: kardox. le govari Hawar, jimre 32,L.4-7,Dimasiq: 1941.

Xenophon: Anabase. T.ll.p.175-185:(Notes com plementaires) page N 7.

V.MINORSKY:(kurdes) in Encyclopedie de Islam, T. ll, E-K, Paris: 1927.pp.1197-1196.

Hinna Fiee: Jalons pour une histoire de l Eglise en Iraq in >> Scriptorum Christianorum Orientalium, Lo-van: Lovan: 1970, P. 110-112.

J. M. MERIGOUX: Un precurseur de dialogue islam-chretian: Frere Ricoldo, R. Th., 4, Paris: 1974.

E. B. SOEN: A short Anthology of Guran Poetry, in Journal of the Royal Asiatic Society, Pt 1, 1921, P.

T. BOIS: Coup d oeil sur la litterature kurde, Al `` machriq, Mars 1955, P. 206. تۆما بوا . 57-81.

Voyage d Ibn Battita, ed. et tr. francaise: C. Defremery et B. R. SAnguinetti, Paris, Vol. II, P. 134-138, ) 141-142.

Raphael J. Bidawid: Les ettres du Patriarche Nestorien Thimote 1, Cittadel Vatican 1956.

کتێبە چاپکراوەکانی دیکەی نووسەر:

١- ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم. شانۆنامە. بڵاوکراوەی یەکیەتیی نووسەرانی کوردستان - شاخ: ١٩٨٤.

٢- بەیانی باش ئەی غەریبی. شانۆنامە. بنکەی یەکگرتن لە کۆپنهاگن: ١٩٨٨ .

٣- Exil شیعر. بڵاوکراوەی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، پاریس: ١٩٩٢.

٤- ژمارەکانی گۆڤاری کوردستان (ئەستەمبۆڵ: ١٩١٩)، دەزگای گوڵان، هەولێر: ١٩٩٨.

٥- ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەڕەنسی، سەنتەری برایەتی، هەولێر: ١٩٩٨.

٦- سەرچاوەکانی کوردناسی، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی: ١٩٩٨.

٧- زێڕی ناو زبڵ. تۆژینەوە و تێکستی وەرگێڕدراوی کوردۆلۆژی، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ١٩٩٩ .

٨- ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، دهۆک: ١٩٩٩. (چاپی دووەم بە کرمانجیی ژووروو)

٩- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسەکاندا، بنکەی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.

١٠- جوایەز، شیعر (بە هاوبەشی شاعیرانی دیکەی هەولێر)، دەزگای ئاراس: ١٩٩٩.

١١- سپیاتییەکانی ناو ڕەش، شیعر. بنکەی وێران، هەولێر: ١٩٩٩.

١٢- دراسات فی تاریخ الکورد. ترجمە: ترزە جاف، رابطە کاوا، بیروت: ١٩٩٩.

١٣- مەلا مەحموودی بایەزیدی، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٠

١٤- ڕۆژنامەی کوردستان(١٨٩٨)، بە هاوبەشی، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی: ٢٠٠٠

١٥- پەتاتەخۆرەکان، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر: ٢٠٠٠. (چاپی دووەم: بنکەی گۆڤاری هاڤیبوون، بەرلین: ٢٠٠٢).

١٦- مێژووی شانۆ لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەزگای ئاراس: ٢٠٠١ .

١٧- مولازم تەحسین و شتی تریش، نۆڤلێت. بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی: ٢٠٠١ .

١٨- ژەنەراڵ شەریف پاشا، تۆژینەوەی مێژوویی، دەزگای سەردەم: ٢٠٠١ .

١٩- چۆڵستان، وەرگێڕانی کۆمەڵە چیرۆکی پەتاتەخۆرەکان بۆ ڕێنووسی لاتینی - کرمانجیی ژووروو، دەزگای ئاڤێستا، ئەستەمبۆڵ: ٢٠٠١

٢١- جوایەز (بەرهەمی هاوبەش لەگەڵ شاعیرانی دیکەی هەولێر)، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠١.

٢٢- عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەزگای سپیرێز، دهۆک: ٢٠٠٢

٢٣- مێژووی وەرگێڕان لە ئەدەبیاتی کوردیدا لە کۆنەوە تا ١٩٣٢، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، هەولێر: ٢٠٠٢

٢٤- سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٢

٢٥- پیاوێکی شەپقەڕەشی پاڵتۆڕەشی پێڵاو شین، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٣.

٢٦- منداڵباز، ڕۆمان، بڵاوکردنەوەی ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر: ٢٠٠٣

٢٧- حەشیشەکێشەکان، شانۆنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر: ٢٠٠٣

٢٨- باوک، شانۆنامە، نووسینی ئۆگۆست ستریندبێرگ، و. لە فەرەنسییەوە، دەزگای ئاراس: ٢٠٠٤

٢٩- باخچەیەک شیعری فەرەنسی، لە فەرەنسییەوە، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ٢٠٠٤

٣٠- ڕێبازە ئەدەبیەکان، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٤

٣١- چەند نامەیەکی فەرەنسی، سەنتەری ڕووناکبیریی هەتاو، هەولێر: ٢٠٠٥

٣٢- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەوروپییەکاندا، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر: ٢٠٠٥